شانۆنامە

# سۆزانییە بەڕێزەکە


نووسینی

ژان پۆل سارتر

وەرگێڕانی لە فەرەنسییەوە

فەرهاد پیربال

***حکومەتی هەرێمی کوردستان***

***وەزارەتی رۆشنبیری***

***بەڕێوەبەرایەتی خانەی وەرگێڕان***

- **ناوی کتێب: سۆزانییە بەڕێزەکە**
- **نووسینی: ژان پۆل سارتر**
- **وەرگێڕانی لە فەرەنسییەوە: فەرهاد پیربالْ**
- **پیتچنین و نەخشەسازی : کەمال عەبدولهادی**
- **دیزاینی بەرگ:**
- **تیراژ: ١٠٠٠**
- **زنجیرە: ١٦٦**
- **ژمارەی سپاردن (٥١٦) ساڵی (٢٠٠٧)**
- **چاپ:**
- **چاپی یەکەم**

سارتر ئەم شانۆنامەیەی پێشکەش کردووە بە میشێل

لێرس و زێت لێرس.

منیش وەرگێڕانە کوردییەکەی پێشکەش دەکەم بە

هونەرمەندی بێ سەروشوێن، هاوڕێم (کەریم عوسمان).

# پێشەکیی وەرگێڕ

ژان پۆل سارتر (١٩٠٥ – ١٩٨٠)، نووسەری ئەم شانۆنامەیە، بەر لە جەنگی جیهانیی یەکەمو دوای جەنگیش هەر، تەنانەت تا کۆتایی ساڵانی حەفتاکانیش.. بەردەوام.. ڕاستەوخۆ.. هەستی دەکرد بەرپرسیاری هەموو ئافاتو جەنگو برسێتیو بەدبەختییەکی مرۆڤە.. ڕووبەڕووی هەموو زوڵمێكو دەستەویەخەی هەموو غەدرێك لەم جیهانەدا دەبۆوە. ئەمەتا، لەم شانۆنامەیەدا (سۆزانییە بەڕێزەکە)، کە بریتییە لە تەنیا تنۆکێك لە زەریای نووسراوەکانی ئەم فەیلەسووفە، ژان پۆل سارتر کامێرای بینینی خۆی دەخاتە سەر وڵاتی ئەمریکا، دەمانباتە ناو شارێکی بچکۆلەی باشووری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا: بزانین لەوێ چ خەبەرەو مرۆڤ لەوێ چۆن دەژیو ژیان لەوێ چ بەهاو مانایەکی هەیە؟



ئامانجی سارتر تەنیا ئەوە نەبوو تراژیدیای مرۆڤ یان تاکەکەس بەدەست کۆمەڵگەو ڕژێمو سیستەمەکانەوە دەربڕێت، بەڵکو دەیویست لە گۆشەنیگای فەلسەفە تایبەتییەکەی خۆیەوە ئەم کارە بکات: فەلسەفەی بوونگەرایی (ئێگزیستانسیالیزم) کە گرنگترینو کاریگەرترین فەلسەفەی بەرگریکردنە لە ئازادیی تاکەکەسو مافەکانی. ژان پۆل سارتر خۆی دامەزرێنی ئەو فەلسەفەیە بوو.

راستییەکەیشی، زۆر لەوانەی سارتر ناسن، پێیان وایە کە ئەم فەیلەسووفە مرۆڤدۆستە لەبەر خاتری گەیاندنی فەلسەفەکەی خۆی پەنای بردۆتە بەر فۆرمی شانۆنامەو ڕۆمانو چیرۆك. ئەم قسەیە ئەگەر ڕاستیش بێت، هیچ لە بایەخی بەرهەمە ئەدەبییەکانی ئەو کەم ناکاتەوە. ئەمەش چونکە، نەك هەر سارتر، بەڵکو هەموو ڕۆماننووسو شانۆنامەنووسێك فەلسەفەیەکی تایبەت بە خۆیو دیدێکی شەخسیی خۆی، دەبێ هەر هەبێت (تەنانەت مەرجیشە) بۆ نووسینی بەرهەمەکەی.

شانۆنامە لای سارتر، بەمەی ئێستاشەوە، جێگەیەکە بۆ دەربڕینی راستی: لە پێناو ئەوەی کە مرۆڤ لەوێدا بتوانێ خۆی دروست بکاتەوەو بتوانێ هەڵبژێرێتو بڕیار بداتو ئازاد بژی.

ژان پۆل سارتر، کە زیاتر لە هەشت شانۆنامەی ناودارو گرنگی نووسیوە، لە هەر هەموو شانۆنامەکانیدا، گرێو دراماو پاڵەوانو رووداوەکانت بە شێوەیەکی ئەوتۆ بۆ دەچنێتو دەگێڕێتەوە کە ناچارت بکا تەنیاو تەنیا لە گۆشەنیگای فەلسەفەکەی خۆیەوە تەماشەی ژیانو مرۆڤو گرفتەکانیان بکەیت. واتە ژیان چۆنەو واقیع چۆنە. بە شێوەیەکی فۆتۆگرافی یان رەخنەگرانە بۆ ناگێڕێتەوە، بەڵکو فەلسەفەی خۆیت لەبارەی ژیانو مرۆڤەوە (لە رێگەی چەند پاڵەوانو رووداوێکەوە کە بۆ خۆی ورد ورد چنیونی) بۆ دەخاتە روو.

بێگومان، ئەرکی نووسینو هەموو نووسەرێکی رەسەنیش هەر دەبێ ئاوها بێ. چونکە نووسین، بە راستی، موئامەرەیەکی بەخشندەو خێرخوازە لە پێناو



ئازادکردنی خوێنەر..

سۆزانییە بەڕێزەکە، نموونەی یەکێك لە باشترین شانۆنامەکانی ژان پۆل سارترە، کە لەوێدا نووسەر سروشتو ناواخنی (دەسەڵات) بەوپەڕی باریکبینییەوە لە دیدی هونەرمەندانەی خۆیەوە، بۆ خوێنەر شیتەڵ دەکاتەوە.. تا رادەی ئەوەی کە خوێنەر لە کۆتاییدا لە خۆی دەپرسێ: باشە ئەم سۆزانییە لەشفرۆشە ئینسانترو بەئەخلاقترو بەشەرەفترە یان ئەو پەرلەمانتارو بۆرژواو مەسئوولانەی کە خۆیان بە نوێنەری میللەت دەزانن...؟!.

# سۆزانییه بەڕێزەکه

## ژان پۆل سارتر

### له فەرەنسییەوە: فەرهاد پیربال

*J-P. SARTRE*

*La Prostitué Respecteuse.*

*Gallimard, Paris, 1947.*

**کەسایەتییەکان**:

لیزێ

فرێد

سیناتۆر

قولەڕەش

جۆن

جێمس

چەند پیاوێك...

# تابلۆی یەكەم

ژوورێك له شارێكی باشووری ئەمریكا، دیوارەكانی سپین. نیو تەختێكی پاڵدانەوە. لای راست پەنجەرەیەك، لای چەپیش دەرگای حەمام. بنەبانی شانۆ رێڕەوێكی لێیە كه دەچێتەوە سەر دەرگای هاتنەژوورەوە.

## دیمەنی یەكەم

## لیزێ، پاشان قولەڕەش

پێش ئەوەی پەردە هەڵدرێتەوە، دەنگی رەشەبا لەسەر شانۆ دێتە بەرگوێ. لیزێ تەنیایە، قۆڵی لێ هەڵكردووەو گسكه كارەباییەكە لەناو ژوورەكەدا بەكاردێنێ. زەنگی دەرگا بەرز دەبێتەوە. لیزێ رادەمێنێتو چاو دەكاتە دەرگای حەمامەكە. دیسان له زەنگی دەرگا دەدەنەوە. گسكەكە له كار دەوەستێنێو دەچێ دەرگای ژووری حەمام لاوو نیو دەكاتەوە.

لیزێ (بە دەنگێكی نزم): وا له دەرگا دەدەن. خۆت دەرمەخە!





(دەچێ دەرگا دەكاتەوە. قولەڕەش لەناو دەرگاوە وەدیار دەكەوێ. قولەڕەشێكی قەڵەوی زەبەلاح، قژی سپی. شپرزەو رەنگ هەڵبزڕكاو) چییە ئەوە؟ ئێوە لەوانەیە رێتان لێ تێك چووبێ (ساتێ بێدەنگی) باشە، ئاخر چیتان دەوێ؟ دە، قسە بكە!

قولەڕەش (دەپاڕێتەوە): تكاتان لێدەكەم، مەدام، تكاتان لێدەكەم.

لیزێ: تكای چیم لێدەكەی؟ (باشتر لێی ورد دەبێتەوە) راوەستە، كوا بزانم! ئەرێ تۆ نەبووی لەناو شەمەندەفەرەكە بینیتم؟! دەی، توانیت غار بدەیو له دەستیان رزگار بیت؟ چۆن ناونیشانی منت دۆزییەوە؟

قولەڕەش: زۆر گەڕام، مەدام، هیچ شوێنێك نەما بە دووایدا نەگەڕێم. (ئاماژەیەك دەكات بۆ ئەوەی بتوانێ بێتە ژوورەوە) تكاتان لێدەكەم.

لیزێ: نەیەیتە ژوورەوە. میوانم هەیە. بەڵام پێم بڵێ چیت دەوێ؟

قولەڕەش: تکاتان لێدەکەم.

لیزێ: باشە، باش. چیت دەوێ؟ پارەت دەوێ؟

قولـەڕەش: نـا، مـەدام. (بێـدەنگی) تکاتـان لێدەکـەم، تەنیا ئەوەندەم دەوێ پێی بڵێن کـە مـن هیـچم نەکردووە.

لیزێ: بە کێ بڵێم؟

قولـەڕەش: بـە دادوەر بڵـێن. تکایـە، مـەدام، تـەنیا ئەوەندەی پێ بڵێنو بەس.

لیزێ: من هیچ ناڵێم.

قولەڕەش: تکاتان لێدەکەم.

لیـزێ: هـیچ هـیچ هـیچ. ژیـانی خـۆم پـڕە لـە دەردو بـەڵا. هـەر گرفتـی خـەڵکی دیکـە مـابوو. سـەرم نایەشێ پەڕۆی لـێ نابەستم. بڕۆ.

قولـەڕەش: ئـاخر تـۆ دەزانـی مـن هیـچم نـەکردووە. باشە من هیچم کردووە؟

لیزێ: تۆ هیچت نەکردووە، بەڵام من تاقەتی ئـەوەم نییە بێمە بەردەم دادوەرو شایەتی بۆ تۆ بدەم.





من هەرچـی دادگـاو پـۆلیسو مـۆلیس هـەن بـە پوولێك نایانکرم.

قولەڕەش: توخوا تاقـەتم نـەماوە. مـاڵو منداڵـەکانم جێهێـشتووەو بـە درێـژایی دوێنـێ شـەو هـەر غارەغارم بووە.

لیزێ: بڕۆ ئەم شارە بەجێ بێڵە!

قولـەڕەش: کـەمینیان بـۆم داناوەتـەوە لـە هـەموو وێستگەکاندا.

لیزێ: کێ کەمینی بۆت داناوەتەوە؟

قولەڕەش: سپی پێستەکان.

لیزێ: کام سپی پێست؟

قولـەڕەش: هـەموویان. ئێـوە دەڵێـی ئـەم بەیانییـە نەچوونەتە دەرەوە!؟

لیزێ: نەخێر.

قولــەڕەش: یــەك دنیــا خــەڵك ڕژاونەتــە ســەر شەقامەکان. گـەنجو پـیر، بـێ ئـەوەی یـەکتریش بناسن کەوتوونەتە مقۆمقۆ.

لیزێ: ئینجا چییە، ئەمە چی دەگەیەنێ؟

قولەڕەش: ئەوە دەگەیەنێ کە من ئیتر هێندە بەملاو بەولادا پەلەقاژێ دەکەم تا ئەو کاتەی دەسگیرم دەکەن. دەزانی: هەر وەختێ دوو سپی پێست، بێ ئەوەی یەکتریش بناسن، لەگەڵ یەکتر کەوتنە قسە، ئیدی لەو بەینەدا قولەڕەشێك هەر دەبێ سەری تیا بچێت. (بێدەنگی). خانم، تکایە پێیان بڵێ کە من هیچ خەتایەکم نییە. تەنیا ئەمە بە دادوەر بڵێو تەواو. بەو کەسانە بڵێ کە لە ڕۆژنامەکاندا کار دەکەن بەڵکو بڵاوی دەکەنەوە. بڵێیت، توخوا!

لیزێ: هاوار هاوار! میوانم هەیە. (بێدەنگی). بۆ ڕۆژنامان گفتت نادەمێ. کاتی ئەوە نییە خۆم دەربخەم. (بێدەنگی). بەڵام ئەگەر بێنو بە زۆری داوام لێبکەن شایەدی بدەم، ئەوا بەڵێنت دەدەمێ، باش، ڕاستییەکەیان پێ دەڵێم.

قولەڕەش: پێیان دەڵێی کە من هیچم نەکردووە؟





لیزێ: پێیان دەڵێم.

قولەڕەش: بەڵێنم دەدەیتێ، مەدام؟

لیزێ: ئا، ئا.

قولەڕەش: سوێند بەو خوایەی لەسەر سەرمانە؟

لیزێ: ئۆوەه! دە وەل بە ئیتر. من بەڵێنم پێت دا، بیبڕەوە ئیتر. (بێدەنگی). دە بڕۆ دەی. ئێ، دە بڕۆ!

قولەڕەش (لەناکاو): تکات لێدەکەم، لای خۆت بمشارەوە!

لیزێ: بتشارمەوە؟

قولەڕەش: حەز ناکەی؟ مەدام، توخوا، نامشاریتەوە لای خۆت؟

لیزێ: بتشارمەوە؟ من بتشارمەوە! دە فەرموو (دەرگای لە روو دادەخا) سەرم نایەشێ پەڕۆی لێ نابەستم (بەرەو دەرگای حەمامەکە دەڕوا) فەرموو بچۆرە دەرەوە!

فرێد دەستی لەناو قۆڵی کراسی، بێ قەرەوێت دێتە دەرەوە.

# دیمەنی دووەم

## لیزێ، فرێد

فرێد: ئەوە چی بوو؟

لیزێ: هیچ نەبوو.

فرێد: من وامزانی پۆلیس بوو.

لیزێ: پۆلیس؟ تۆ هیچت لەگەڵ پۆلیس هەیە؟

فرێد: من، نەخێر. گوتم لەوانەیە ئیشیان بە تۆ هەبووبێ.

لیزێ (بە هەڕەشەوە): من بە درێژایی ژیانم پێنج فلسی هیچ کەسێکم نەخواردووە تا پۆلیس بکەونە دوام.

فرێد: هەر قەت دەستەویەخەی پۆلیس نەهاتوویتەتەوە؟

لیزێ: بەهەرحاڵ، لەسەر دزی، نا.

(لیزێ گسکە کارەباییەکە دەخاتە کارو گرەگرەکەی بەرز دەبێتەوە).

فرێد (بە گرەگرەکە جاڕس بووە): ئۆوەه!





لیزێ (هاوار دەکا بۆ ئەوەی فرێد گوێی لێبێ): چیتە ئەوە ئازیزم؟

فرێد (هاوار دەکا): پەردەی گوێم دڕا.

لیزێ (هاوار دەکا): وا تەواو دەبم (بێدەنگی). چی بکەم.

فرێد (هاوار): چی؟

لیزێ (هاوار): دەڵێم چی بکەم، من ئیتر وا راهاتووم.

فرێد (هاوار): چۆن راهاتووی؟

لیزێ (هاوار): ئاوها. ئەو شەوەی میوانم هەبێ، بۆ سبەینەکەی، دەبێ ژوورەکە گسك بدەمو خۆشم بشۆم.

(گسکە کارەباییەکە دەکوژێنێتەوە).

فرێد (پەنجە بۆ ناو نوێنەکە درێژ دەکا): کەوابوو، دە ناو نوێنەکەش داپۆشە!

لیزێ: چی؟

فرێد: دەڵێم: ناو نوێنەکەش داپۆشە. بۆنی گوناهی لێدێ.

لیزێ: گوناه؟ ئەم قسەیەت لە کوێ هێنا؟ تۆ دەڵێی قەشەیت قسەم لەگەڵ دەکەی. تۆ قەشەی؟

فرێد: نەخێر. بۆچی؟

لیزێ: چوزانم، بە زمانی ئینجیل قسە دەکەی (لیزێ تەماشای دەکا) نا، تۆ قەشە نیت. تۆ باش بایەخ بە ڕێکپۆشیی خۆت دەدەیت. کوا بزانم ئەنگوستیلەکانت (بە سەرسامییەوە) ئەڵڵاهـ .. دەی دەی.. دەوڵەمەندی!؟

فرێد: بەڵێ.

لیزێ: زۆر دەوڵەمەندی؟

فرێد: زۆر.

لیزێ: باشتر (دەستەکانی ئەڵقە ئاوێزی ملی دەکاو لێوی لە لێوی نزیک دەخاتەوە) وا بزانم دەوڵەمەندی بۆ پیاو باشترە، وای لێ دەکا متمانەی زۆرتر بە خۆی هەبێت.

فرێد: ناو نوێنەکە داپۆشە!

لیزێ: باش، باش، دەچم دایدەپۆشم. (بەدەم





داپۆشینی ناو نوێنەکەوە، لە بەرخۆیەوە پێدەکەنێ). بۆنی گوناهی لێدێ.. من وام نابینم. با وا بێ. بەڵام خۆ ئەمە گوناهی تۆیە، ئازیزم. (فرێد مۆڕەی لێدەکا) باشە، باشە، هی منیشە. بەڵام من ئەم جۆرە گوناهانەم هێندە بۆ نووسراون هەر لە ژمارە نایەن. (لەسەر سیسەمەکە ڕۆدەنیشێو فرێدیش لە تەنیشت خۆی دادەنیشێنێ) وەرە، وەرە با لەسەر گوناهەکەمان دانیشین. گوناهێکی خۆش بوو، وا نییە؟ گوناهێکی خنجیلانە بوو (پێدەکەنێ) چاوەکانت دامەگرە! دەتترسێنم؟ (فرێد بە توندییەوە دەینووسێنێ بە خۆیەوە) ئاخ، ئەزیەتم دەدەی. تۆ ئازارم دەدەی. (فرێد بەری دەدا) کابرایەکی عەنتیکەی! پێ ناچێ پیاوێکی باش بیت، تۆ. (بێدەنگی) پێم بڵێ، تۆ ناوت چییە! پێم نالێی؟ ناخۆشە ئەمە، دەزانی: کە تۆ ناوی خۆت بە من نالێی! کەس نازناوی

خۆی بە من نالێ. خۆ هەقیشیانە، دەی با تۆ یەکەمین کەس بیت ناوی خۆت بە من دەڵێی! باشە من ئەگەر ناوی کەستان، چۆن یەکێکتان لە ئەوی دیکەتان جودا بکەمەوە؟ دە ناوی خۆتم پێ بڵێ، ئازیزەکەم، دەی!

فرێد: نا.

لیزێ: باشە، ناوت لێدەنێم "جەنابی بێ ناو". (لیزێ هەڵدەستێتەوە) راوەستە با ژوورەکە بێنمەوە سەر خۆی. (هەندێ کەلوپەل رێك دەخاتەوە). ئێرە، ئەمەتا. ئێستا هەموو شتێك رێکە. کورسییەکان بە دەوری مێزەوە: بەم شێوەیە رێکترە. ئەرێ بە راست تۆ هیچ دواکاندارێك ناناسی کە تابلۆ بفرۆشێ؟! حەز دەکەم چەند تابلۆیەك بکڕم و بە دیواریان هەڵواسم. خۆم تابلۆیەکم هەیە بە ناوی (گوڵدانی شکاو)، فەرەنسییە. کچۆڵەیەکە، بەستەزمانەی، گوڵدانەکەی لێ شکاوە.





فرێد: کام گوڵدان؟

لیزێ: چوزانم، گوڵدانی خۆی. هەڵبەتە دەبێ گوڵدانێکی هەبووبێ. بەڵام من وێنەی پیرەژنێکم دەوێ، داپیرەیەك، کە خەریکی چنین بێ، یان دانیشتبێ حەکایەت بۆ رۆڵەکانی بگێڕێتەوە. ئا، بە راست، با بچم پەنجەرەکە بکەمەوە. (کارەکە دەکا). هەوایەکی چەنێك خۆشە! دیارە رۆژێکی خۆش دەبێ، ئەمڕۆ. (خۆی لە بەریەك رادەکێشێ) ئاهەی، ئەمڕۆ دڵم زۆر خۆشە، هەوایەکی خۆش! حەمامێکی خۆشیشم کرد، شەوێکی خۆشیشم گوزەراندووە. وەرە، وەرە! وەرە تەماشای ئەو دیمەنە بکە کە من لێی دەڕوانم. دیمەنێکی جوان. چاو بە هەر لایەکدا دەگێڕی، دارو درەختی رازاوە. نازانم من چ بەختێکم هەبوو: بە بێ ئەزیەت ئەم خانووەم لەم گەڕەکە خۆشەدا وەدەست کەوت. نایەی؟ تۆ شارەکەی خۆتت خۆش ناوێ؟

فرێد: من لە پەنجەرەی خۆمەوە خۆشیم دەوێ.

لیـزێ (لـەناكاو): بـە راسـت، ئـەرێ هـەر لەگـەڵ سـبەینەی سـاڵمان، چـاوت بـە قولەڕەشـێك بكەویێت، مایەی بەدبەختی نییە؟

فرێد: بۆچی ئەمە دەپرسی؟

لیـزێ: ئـاخر.. مـن.. ئـەوەتا.. قولەڕەشـێك، بەسـەر شۆستەی بەرامبەرمەوە.. تێدەپەڕێ.

فرێـد: بینینـی قولـەڕەش هەمیـشە بەدبـەختیی بەدواوەوەیە. قولەڕەش لە ئیبلیس بەدفەڕترن. پەنجەرەكە داخە!

لیزێ: تۆ ناتەوێ من بتوانم هەناسە بدەم؟

فرێد: دەڵێم پەنجەرەكە داخە. پەردەكانیش دادەوە. گڵۆپەكەش داگیرسێنە!

لیزێ: بۆ؟! ئەم هەموو شتە، لەبەر قولەڕەش..؟

فرێد: گەمژە.

لیزێ: بەم خۆرەتاوە خۆشە!

فرێـد: مـن لێـرە پێویـستیم بـە خۆرەتـاو نییـە.





دەمەوێ ژوورەكەت لەسەر هەمان باری "شـەو" بمێنێتەوە. پێم وتی پەنجەرەكە داخـە! مـن بـۆ خۆم لە دەرەوە دەتوانم خۆر ببینـم.

(فرێد هەڵدەستێتەوە، بەرەولای دەچێو تەماشای دەكا)

لیزێ (بە شپرزەییەوە): چی قەوماوە؟

فرێد: هیچ. قەرەوێتەكەمم بدەرێ!

لیزێ: لە حەمامەكەیە (لیزێ دەچێتە دەرەوە. فرێد بە پەلـە چـەكمەجەكانی مێزەكـە رادەكێـشێتو بـە دوای شـتێكدا دەگـەڕێ. لیـزێ: دەسـت بـە قەرەوێتــەوە دێتــەوە ژوورێ) هانــێ، ئەمــەش قەرەوێتەكەت. راوەستە! (قەرەوێتەكە لـە ملی دەبەسـتێ). دەزانـی: كـەم رێ دەكـەوێ مـن مـشتەریی رێگـوزەر پەسـەند بكـەم! ئەمـەش چـونكە هـەرجارەو سـەروگوێلاكێكی تـازەم لێدێتە ژوورەوە. من حـەز دەكـەم تـەنیا سـێ – چـوار مـشتەری پـێم رابـێن، ئـەویش – ئـاوا – كەوتبێتنـە نـاو ساڵەوە، یـەكێك بـۆ رۆژی سـێ

شەمووان، یەکێك بۆ پێنج شەمووان. ئەوەی دیکەش بۆ رۆژانی یەکشەممەی ئاخری هەفتە.

تۆ، باشیت: ئەگەرچی گەنجیت، بەڵام بە رەفتار لە خۆگەڕاوەی. ئیدی ئەگەر جار بە جار حەزت لێبوو.. دەی، باشە، من هیچی دیکە ناڵێم. خۆت دەزانی.. تۆ زۆر قۆزیت، دەزانی! عەینەن "ئەستێرەیەك". دە ماچێکم بدەرێ، دەی، ئازیزەکەم، لە پاداشتی ئەو زەحمەتەی بۆتم چەشت، ماچم بکە. حەز ناکەی باوەشێکم پێدا بکەی؟

(فرێد لەناکاو توند ماچێکی دەکاتو لە خۆی دوور دەخاتەوە) ئۆف..

فرێد: تۆ ئیبلیسی.

لیزێ: ها؟

فرێد: تۆ ئیبلیسی!

لیزێ: دیسان بات دایەوە بە زمانی ئینجیل قسەم لەگەڵ بکەی؟





فرێد: هیچ. گاڵتەم کرد.

لیزێ: شێوازێکی ناجۆرت بۆ گاڵتەکردن هەیە. (بێدەنگی). باشە، دەی، بە دڵت بوو؟

فرێد: چیم بە دڵ بوو؟

لیزێ (لاسایی دەکاتەوە): چیم بە دڵ بوو؟ ئاخ "کوڕیژگەی بەستەزمان" چەنێك خەشیمی!

فرێد: ئا – م، بەڵێ. زۆرم بە دڵ بوو. خۆش بوو. چەندت دەوێ؟

لیزێ: کێ باسی پارەی لەگەڵ کردووی؟ من تەنێ ئەوەتم لێپرسی ئاخۆ بە دڵت بووم یا نا؟ تۆش دەتوانی دڵنەرمانە وەڵامم بدەیتەوەو تەواو. چییە ئەمە؟ بە راست – بە راست: بە دڵت نەبووم؟ باوەڕ ناکەم. بەلامەوە سەیرە.

فرێد: بەسیەتی ئیتر.

لیزێ: چونکە بە بیرمە، تۆ توند توند منت بە سینەی خۆتەوە دەگوشی، جگە لەمەش بە ئەسپاییەوە پێت گوتم "خۆشم دەوێی..".

فرێد: تۆ سەرخۆش بوویت.

لیزێ: نەخێر وا نییە! سەرخۆش نەبووم.

فرێد: با. سەرخۆش بووی.

لیزێ: من پێت دەڵێم سەرخۆش نەبووم.

فرێد: باش، من خۆم سەرخۆش بووم.. دەی. هیچیشم نایەتەوە بیر.

لیزێ: بەداخەوە! من جلوبەرگی خۆمم لەناو حەمامەکە داکەند. کاتێ بەرەو لات هاتم، تۆ رەنگت سوور هەڵگەڕا. بە بیرت نایە؟ بە بیرت نایە گڵۆپەکەت کوژاندەوەو لەناو تاریکیدا لێم نزیك کەوتیتەوەو دەستت بۆ درێژ کردم؟ من ئەم گڵۆپ کوژاندنەوەیەتم پێ خۆش بوو: پیاوانەو بە حورمەتەوە بۆم هاتیت.. بە بیرت نایەتەوە؟

فرێد: نەخێر.

لیزێ: ئەدی ئەو ساتەی پێکەوە رووت وەك دوو منداڵی تازە زاو لەناو یەك بێشکەدا یاریمان





لەگەڵ یەکتر دەکرد؟ خۆ ئەمەت لەبیرە؟

فرێد: دەڵێم بیبڕەوە ئیتر! دەمت داخە! ئەوەی لە تاریکیدا دەکرێ، لەناو هەمان تاریکیدا کۆتایی پێ دێ. پێی ناوێ بە رۆژ قسەی لە بارەیەوە بکرێ!

لیزێ: من پێم خۆشە باسی بکەمەوە. دەزانی؟ من زۆر خۆشم رابوارد.

فرێد: ئاهاه ..! زۆر خۆشت رابوارد! (بەرەو لای لیزێ دەڕوا. دەستی لاواندنەوە بە شانەکانیدا دەهێنێو دەستەکانی دەئاڵێنێتە ملی). ئێوەی ژن هەمیشە پێتان خۆشە کاتێ پیاو ئازارتان دەدەن. (بێدەنگی). ئەو شەوەی لەگەڵ مندا راتبوارد: من لەبیرم کرد. تەواو. بیرم چۆتەوە. من تەنیا ئەو ساتانەم لەبیر نەچۆتەوە کە سەمامان پێکەوە دەکرد. کاتەکانی دیکەی شەو تەنیا لە بیری تۆدا ماونەتەوە. تەنیا تۆ، تێگەیشتی. (قورگی دەگرێ).

لیزێ: ئەوە چی دەکەی؟

فرێد: دەست دەنێمە قوڕگتەوە.

لیزێ: تۆ ئازارم دەدەی!

فرێد: تەنیا تۆ! ئەگەر کەمێك قایمتر دەستم داگرم ئیدی هیچ کەسێك لە دنیا نامێنێ کە ئەم شەوەی لەیاد بمێنێ! (دەستی لێ هەڵدەگرێ). چەندت بدەمێ؟

لیزێ: ئەگەر تۆ لەیادت چووبێتەوە مانای وایە من باش ئیشم نەکردووە. کەواتە من حەز ناکەم پارەت لێ وەربگرم.

فرێد: قسەی لەم جۆرە مەکە. چەندت بدەمێ؟

لیزێ: گوێ بگرە، من لە پێرێوە هاتوومەتە ئێرە. تۆ یەکەمین کەسیت هاتووی بۆ لام. با بە خۆڕایی بێتو پارەم ناوێ. بەڵکو خێریشی پێوە دەبێ.

فرێد: پێویستیم بە دیاریی تۆ نییە.

(دە دۆلارییەك دەخاتە سەر مێزەکە).





لیزێ: منیش پێویستیم بە پارەی ناچیزەی تۆ نییە، بەڵام دەمەوێ بزانم تۆ من بە چەند دەنرخێنی؟ بوەستە با لێکی بدەمەوە (دە دۆلارییەکە لە دەست دەگرێتو چاوەکانی دەنووقێنێ) چل دۆلار؟ نا، ئەمە زۆرە، جگە لەمەش لەو کاتەدا دەبووایە دوو پارچە بووایە. بیست دۆلار؟ نا؟ کەواتە دەبێ زیاتر لە چل دۆلار بێت؟ پەنجا دۆلار؟ (بە درێژایی ئەو ماوەیە فرێد تەماشای دەکاو بێدەنگ پێدەکەنێ). قەیناکە هەرچەند بێ، چاوم دەکەمەوە. (تەماشای پارچەی پارەکە دەکات) بە سەهوو نەچوویتە؟

فرێد: باوەڕ ناکەم.

لیزێ: تۆ ئاگات لێیە چیت داوەتە من؟

فرێد: بەڵێ.

لیزێ: هەڵیگرەوە. هەڵیگرەوە دەی (بە دەست پێی دەڵێ نامەوێ) دە دۆلار! خۆت تالان کرد.

کچێکی جوانکیلەی وەکو من، بە دە دۆلار! تۆ دیارە ئەو رانە نازدارانەی منت نەدیت؟ (رانی خۆی بۆ دەردەخا). ئەدی ئەو مەمکانەم، نەتدین؟ ئەم مەمکانەم بایی بیست دۆلارن. پارەکەت هەڵگرەوەو عەرەبانەکەت راکێشە، با تووڕە نەبم! جەنابیشت دەتویست دوای هەر تەواوبوونێك دەست پێبکەیتەوە؛ دەشتویست باسی منداڵیی خۆمت بۆ بگێڕمەوە؛ بەم بەیانییە زووەش بە دەموچاوێکی گرژیشەوە هەستاویتو دەڵێی مووچەی مانگانەم دەدەیتێ: ئەم هەموو بەزمەم پێدەکەی، بە چەند؟ چل دۆلار نا، سی دۆلاریش نا، بیستیش نا؛ دە دۆلار!

فرێد: هەر دەستێکم تێت وەردا، ئیتر. ئەمە زۆریشە.

لیزێ: دەست لە خۆت وەردە، هەی بێ حورمەت! دایکت دەبێ حەتمەن ژنێکی بەڕەڵا بووبێتو فێری نەکردبیت چۆن رێزی ژنان بگریت.





فرێد: دەمت دادەخەی، یا نا؟

لیزێ: دایکت حەتمەن ژنێکی بەڕەڵا بووە، سەرسەری..

فرێد (خوێنساردانەو بە رقەوە): با ئامۆژگارییەکت بکەم کچێ: ئەگەر دەتەوێ نەتخنکێنم، چیتر باسی دایکی ئەو پیاوانە مەکە کە دێن سوارت دەبن!

لیزێ (رووبەڕووی دەچێ): بمخنکێنە! دە بمخنکێنە، دەی، با ببینم!

فرێد (دەکشێتەوە): لەسەرخۆ بە، ئارام بەوە! (لیزێ گوڵدانێك لەسەر مێزەکەوە هەڵدەگرێتو دەیەوێ لە سەری فرێدی بشکێنێ). هانێ ئەوە دە دۆلاری دیکەشت دەدەمێ، بەس داسەکنێ! ئارام دەبیتەوە یان حەپست بکەم؟

لیزێ: تۆ؟ تۆ من حەپس دەکەی؟

فرێد: بەڵێ من.

لیزێ: تۆ؟

فرێد: من.

لیزێ: بەلامەوە سەیرە بتوانی.

فرێد: من کوڕی (کلارك)م.

لیزێ: کلارك کێیە؟

فرێد: سیناتۆر. نوێنەری "ئەنجومەنی پیران".

لیزێ: بە راست؟ منیش دەزانی کچی کێم؟ کچی (رۆزفێڵت).

فرێد: تۆ (کلارك)ت دیوە لەسەر لاپەڕەی رۆژنامەکاندا؟

لیزێ: ئینجا چییە؟

فرێد: ئەوەتا سەیرکە (وێنەیەکی پیشان دەدا). من لە تەنیشت ئەو وێستاوم، دەستی خستۆتە سەر شانم.

لیزێ (لەناکاو ئارام دەبێتەوە): ئێ، دە وا بڵێ. کوا ببینم. باوکێکی باشت هەیە.

(فرێد وێنەکەی لە دەست دەسەنێتەوە).





فرێد: بەسە.

لیزێ: پیاوێکی باش دیارە، پیاوێکی رۆح سووکو دادپەروەریش. راستە دەڵێن قسەو گوفتاریشی عەینەن شەکرە؟ (فرێد وەڵام ناداتەوە). ئەو باخچەیە هی خۆتانە؟

فرێد: بەڵێ.

لیزێ: گەورە دیارە. ئەدی ئەو منداڵە بچوکانەی سەر قەنەفەکە، خوشکتن؟ (فرێد: وەڵام ناداتەوە). ماڵەکەتان کەوتۆتە سەر تەپۆلکەیەکەوە؟

فرێد: بەڵێ.

لیزێ: کەواتە سبەینان کاتێ نانی بەیانیت دەخۆی، هەموو شارەکەت لە پەنجەرەکەی خۆتەوە لێ دیارە؟

فرێد: بەڵێ.

لیزێ: لە کاتی نانخواردن زەنگتان بۆ لێدەدەن؟ بە زەنگ لێدان بانگتان دەکەن؟ ئێ دە هیچ نەبێ

وەڵامم بدەوە!

فرێد: شەیپوورمان بۆ لێدەدەن.

لیزێ (بە حەپەسانەوە): شەیپوور!! من سەر لە تۆ دەرناکەم! تۆ کوڕی بنەماڵەیەکی ئاوها بیتو ماڵێکی ئاوهات هەبێ.. چۆن دێی بە پارە لەگەڵ من دەنووی! (بێدەنگی). لەبارەی ئەو قسەیەی بە دایکتم گوت، داوای لێبوردنت لێدەکەم. ئەویش لەناو وێنەکەدایە؟

فرێد: من پێم گوتی ناوی دایکم نەبەی جارێکی تر!

لیزێ: باش. باش. (بێدەنگی). دەتوانم پرسیارێکت لێبکەم؟ (فرێد وەڵامی ناداتەوە). مادام تۆ ئەوەندە بێز لە "خۆشەویستی" دەکەیتەوە، ئەدی بۆچی هاتووی بۆ لای من؟ (فرێد وەڵامی ناداتەوەو لیزێ هەناسەیەك هەڵدەکێشێ). هەر چۆنێك بێ! تا ئەو کاتەی لای منی، من هەوڵ دەدەم خۆم لەگەڵ تۆ رابهێنم.





(ماوەیەك بێدەنگی. فرێد بەرامبەر ئاوێنەکە شانەیەك بە قژی خۆیدا دەهێنێ).

فرێد: تۆ خەڵکی باکووری؟

لیزێ: بەڵێ.

فرێد: خەڵکی نیوویۆرکیت؟

لیزێ: لای تۆ ئەمە چ بایەخێکی هەیە؟

فرێد: ماوەیەك بەر لە ئێستا باسی نیوویۆرکت دەکرد. بۆیە.

لیزێ: هەموو کەسێك دەتوانێ باسی نیوویۆرك بکا. ئەمە هیچ شتێك ناسەلمێنێ.

فرێد: بۆچی بۆ خۆت هەر لەوێ نەمایتەوە؟

لیزێ: جام کە پڕ بوو، لێی دەڕژێ.

فرێد: بێزار ببووی؟

لیزێ: بێگومان. هەرچی گرفتی دنیا هەیە، روو لە من دەکا. هەندێ کەس هەر بە سروشت ئاوها وەکو من چارە رەشن. ئەم مارەت دیوە؟ (لیزێ بازنەکەی پیشان دەدا) ئەم مارەیە بەڵاو گرفتم

بۆ دروست دەکا.

فرێد: ئەدی بۆچی لە دەستی دەکەی؟

لیزێ: مادام هەمە، دەبێ لە دەستی کەم. دەڵێن کە مار زۆر بێ ڕەحمانە تۆڵەی خۆی دەکاتەوە.

فرێد: ئەو ژنە تۆ بووی کە قولەڕەشەکە دەیویست بە زۆری بتخاتە ژێر خۆیەوە؟

لیزێ: چی؟!

فرێد: پێرێ تۆ نەبووی بە شەمەندەفەری خێرای کاتژمێر شەش گەیشتبوویتە ئێرە؟

لیزێ: با.

فرێد: کەواتە تۆ بووی کە قولەڕەشەکە ویستبووی تەعەددات لێ بکا.

لیزێ: هیچ کەسێك دەستی بۆ درێژ نەکردووم. نا. (لیزێ بە کەمێك گاڵتەجاڕییەوە پێدەکەنێ) تەعەددام لێ بکا؟ تۆ ئاگات لە خۆیە چ دەڵێی؟

فرێد: تۆ بووی. با. وێبستەر Webster دوێنێ لەناو سەماخانەکەدا حەکایەتەکەی بۆم گێڕایەوە.





لیزێ: وێبستەر؟ (بێدەنگییەك) ئاها! کەواتە ئەمە بوو مەبەستت!

فرێد: چی؟

لیزێ: کەواتە ئەم هەموو هێن‌و منهێنەت هەمووی لەپێناو ئەمە بوو! لە چاوتەوە دیار بوو هەی مەلعوون! کوڕی پیاوێکی ئەوەندە باشیشیت.

فرێد: دەڵەقۆڕ (بێدەنگی). من ئەگەر بمزانییبا تۆ لەگەڵ قولەڕەشێك نوستووی..

لیزێ: ئێ..؟!

فرێد: من پێنج نۆکەری قولەڕەشم هەیە. کاتێ تەلەفونێکم بۆ دەکرێ‌و یەکێکیان هەڵیدەگرێ، پێش ئەوەی دەسکی تەلەفونەکەم بداتە دەست، پاکی دەکاتەوە.

لیزێ (بە سەرسوڕمانەوە بۆ پیاهەڵدانی، فیتەیەك لێدەدا): ئاها..!

فرێد (بە نەرمییەوە): ئێمە لێرە قولەڕەشمان ئەوەندە خۆش ناوێ. ئەو مرۆڤە سپیانەشمان

خۆش ناوێ کە سەودایان لەگەڵ ئەواندا هەیە.

لیزێ: بیبڕەوە! من رقم لێیان نابێتەوە، بەڵام بۆشیان نییەو رازی نابم دەستم بۆ درێژ بکەن.

فرێد: کێ دەزانێ! تۆ ئیبلیسی. قولەڕەشیش لە تۆ خراپتر. (لەناکاو) دەی.. ئینجا کابرای قولەڕەش ویستبووی تەعەددات لێبکا؟

لیزێ: هەتا ئەگەر واشبێت، بە تۆ چی؟

فرێد: دوو قولەڕەش پێکەوە خۆیان کردبووە ناو فارگۆنەکەتەوە، لەناکاو خۆیان بەسەرتدا دابوو. تۆش کەوتبوویتە هاوار هاوار بۆ ئەوەی خەڵکی سپی بێن رزگارت بکەن. یەکێك لە قولەڕەشەکان بە مووسی ردێنتاشەکەی خۆی پەلاماری پیاوە سپییەکانی دابوو، ئەوانیش نەیانکردبووە نامەردی گوللەیەکیان لێ دابوو. بەڵام قولەڕەشەکەی دیکە رایکردبوو.

لیزێ: وێبستەر بۆتی گێڕاوەتەوە؟

فرێد: ئا.





لیزێ: ئەو لە کوێ ئەمەی زانی!

فرێد: هەموو خەڵك باسی دەکا.

لیزێ: هەموو خەڵك؟ ئەمەش لە بەختی من. باشە ئێوە هیچی دیکەتان نییە قسەی لەسەر بکەن؟

فرێد: باشە ئەمە رووی نەداوە کە من گێڕامەوە؟

لیزێ: بە هیچ شێوەیەك. دوو قولەڕەشەکە ئارام ئارام بۆ خۆیان دانیشتبوونو قسەیان لەگەڵ یەکتر دەکرد؛ تەنانەت سەیریشیان نەدەکردم. پاشان دیتم چوار سپی پێست خۆیان هەڵکوتایە ناو فارگۆنەکەوەو دوو لەو پیاوانە لەملاو لەولاوە کەپسیان کردبووم. لە گەمەی (روگبی) گەڕابوونەوەو بردبوویانەوە. سەرخۆش بوون. دەیانگوت کە بۆنی قولەڕەش لەناو ئەم فارگۆنە دێتو پاشان ویستیان قولەڕەشەکان لە پەنجەرەی شەمەندەفەرەکەوە فڕێ بدەنە دەرەوە. قولەڕەشە بەستەزمانەکانیش بەرگرییان لە خۆ کرد. لە کۆتاییدا یەکێك لە

پیاوە سپی پێستەکان دامربۆکسێکی بە لاچاوی کـەوت. لـەو کاتــەدا بـوو ئـەو سـپی پێـستە دەمانـچەکەی دەرهێنـاو تەقـەی لێکـرد. تـەواو. قولەڕەشـــەکەی دیکـــەش ناچـــار، هـــەر کـــە گەیــشتینە نـــاو وێـــستگەکە، لـــە پەنجـــەرەوە رایکردە دەرەوەو خۆی رزگار کرد.

فرێد: ئەویش دەناسین. هێندەی نـەماوە ئـەویش بـە سزای خۆی بگات. (بێدەنگییەکی کەم). باشە تۆ ئەگەر بتبەنـە بـەردەم دادوەر، حەکایەتەکـە بـە هەمان ئەو شێوەیەی باست کرد دەگێڕیتەوە؟

لیزێ: ئەمە چ پەیوەندییەکی بە تۆوە هەیە؟

فرێد: وەڵامم بدەوە!

لیزێ: من نایـەم بـۆ لای دادوەر. مـن پـێم گـوتی کـە زەندەقم لە شەڕوشۆڕ دەچێ.

فرێد: تۆ دەبێ بێیتە لای دادوەر.

لیـزێ: نایـەم. چـیتر حـەز ناکـەم نـاوم بکەوێتـە نـاو پۆلیسخانەکانەوە.





فرێد: دێن بە دواتدا دەگەڕێن.

لیزێ: کەواتە ناچار دەبم تەنیا ئـەوە بگێڕمـەوە کـە دیومە.

(کەمێك بێدەنگی).

فرێـد: بـیرت لـەوە کردۆتـەوە کـە لـەو کاتـەدا چ هەڵەیەك دەکەی؟

لیزێ: چ هەڵەیەك دەکەم؟

فرێـد: تـۆ دەتـەوێ شـایەدی لەسـەر پیـاوێکی سـپی پێست بدەی لەپێناو رزگارکردنی قولەڕەشەکە.

لیزێ: ئەوجا خۆ وایشە، سپی پێستەکە تاوانبارە.

فرێد: تاوانبار نییە.

لیزێ: لەبەر ئەوەی خەڵکی کوشتووە، تاوانبارە.

فرێد: تاوانبارە بەهۆی چییەوە؟

لیزێ: بەوەی کە ئینسانێکی کوشتووە.

فرێد: قولەڕەشێکی کوشتووە.

لیزێ: ئێ؟

فرێـد: ئـێ.. ئـێ.. تـۆ هـەر جارێـك قولەڕەشـێك

بکوژێتو تاوانبار بکرێی.. ئەمە چۆن دەبێ؟

لیزێ: مافی ئەوەی نەبوو.

فرێد: مافی چیی نەبوو؟

لیزێ: مافی ئەوەی نەبوو.

فرێد: ئەم مافەی تۆ باسی لێدەکەی لەلای خۆتان لە باکوور هەیە. (ماوەیەك بێدەنگی) بەهەرحاڵ ئەگەر تاوانبار بێت یان نا، تۆ بۆت نییە بێیت سزای هاونەژادێکی خۆت بدەیت.

لیزێ: من نامەوێ سزای هیچ کەسێك بدەم. بەڵام ئەگەر بێن داوام لێبکەن کە من چیم دیوەو بیگێڕمەوە، راستییەکەی دەڵێم.

(ماوەیەك بێدەنگی. فرێد بەرەو رووی لیزێ دەڕوا).

فرێد: چی لە نێوان تۆو ئەو قولەڕەشەدا هەیە؟ تۆ بۆچی بەرگریی لێدەکەی؟

لیزێ: هەر ناشیناسم.

فرێد: کەواتە بۆچی..؟

لیزێ: دەمەوێ راستی بڵێم.





فرێد: راستی! سۆزانییەك کە نرخی تەنیا دە دۆلارە دەیەوێ راستی بڵێ! راستی نییە: قولەڕەشو سپی پێست هەیە. تەواو. حەڤدە هەزار سپی پێست، بیست هەزار قولەڕەش. ئێرە نیوویۆرك نییە بزانە؛ ئێمە لێرە ئەم جۆرە شۆخییانە ناکەین. (بێدەنگییەك). تۆماس کوڕی مامی منە.

لیزێ: چی؟

فرێد: تۆماس، ئەو کەسەی قولەڕەشەکەی کوشتووە؛ کوڕی مامی منە.

لیزێ: ئەھ !

فرێد: تۆماس پیاوێکی موئەددەبە. هەرچەند ئەمە لای تۆ هیچ گرنگ نییە، بەڵام ئەو پیاوێکی موئەددەبە.

لیزێ: پیاوی موئەددەب ئاوها دەبێ؛ بتدیبایە چۆن خۆی بە منەوە نووساندبوو و.. دەیویست کۆشم هەڵداتەوە. هەر پیاوی ئاوها

موئەددەبمان بۆ دروست بکەن! بەهەرحاڵ من بەلامەوە سەیر نییە کە ئێوە هەردووکتان سەر بە هەمان بنەماڵەن.

فرێد (دەستی لێ بەرز دەکاتەوە): پیس.. (چاوی خۆی دەگرێ). تۆ ئیبلیسی. ئیبلیس دەبێ تەنیا تێی هەڵبدرێ. تۆماس ویستبووی دامەنت هەڵبداتەوە، گوللەی لە قولەڕەشێکی چەپەڵ داوە، لەمانە باشتر؛ هەموو ئەم شتانە ئەسڵەن هەر پێویستیان بەوە نییە بیریان لێبکرێنەوە. ئەوەی ئێستا دەبێ حسێبێکی بۆ بکرێت ئەوەیە کە تۆماس مەسئوولێکی گەورەی ئێمەیە.

لیزێ: مەسئوولێکی گەورەی ئێوەیە، باش. بەڵام ئەو قولەڕەشە هیچی نەکردووە.

فرێد: قولەڕەش هەمیشە شتێکی هەر کردووە.

لیزێ: من هەرگیز هیچ مرۆڤێك گیرۆدە ناکەمو نایخەمە تەڵەوە.

فرێد: ئەگەر قولەڕەش نەخەیتە تەڵەوە، تۆماس





دەکەوێتە تەڵەکەوە. هەرچۆنێ بێ، دەبێ یەکێکیان هەڵبژێریت. لەسەر خۆت ماوە.

لیزێ: ئەوەتا. قوڕەکە بۆ من گیراوەتەوە. (قسە لەگەڵ بازنەکەی دەکا). پیسی بۆگەن، لە بەڵا زیاتر هیچ سوودێکت بۆ من نەبووە. (بازنەکەی خۆی لە دەست دادەکەنێو فڕێی دەداتە سەر ئەرزەکە).

فرێد: چەند پارەت دەوێ؟

لیزێ: من هیچ پارەیەك وەرناگرم. نامەوێ.

فرێد: پێنج سەد دۆلار.

لیزێ: هیچ.

فرێد: دەبێ زیاتر لە شەوێك کار بکەیت تا ئەو پێنج سەد دۆلارەت دەست بکەوێ.

لیزێ: بە تایبەتیش ئەگەر موشتەریی وەك تۆم هەبێ (بێدەنگییەك). کەواتە بۆ ئەم مەبەستە بوو کە دوێنێ شەو داوات لێکردمو لەگەڵم هاتی؟

فرێد: هەڵبەتە.

لیزێ: کەواتە بۆ ئەمەت بوو. بە خۆتت دەگوت: ئەم گێڵو وێلە هەڵەخەڵەتێنم، لەگەڵی دەچمەوەو مەسەلەی قولەڕەشەکەی پێ چارەسەر دەکەم. ها.. بۆ ئەمەت بوو! دەستەکانی منت توند توند دەگوشیو خۆشت ساردوسڕ، بیرت دەکردەوە: چۆن دەست پێبکەی، داوەکەم بۆ دابنێیتەوەو قسەم لێدەربێنیت؟ (بێدەنگییەك). باشە پێم بڵێ کە تۆ بۆ ئەم مەبەستە بەگەڵ من کەوتیت، چ حەوجەی دەکرد لە لەشم نزیك بکەویتەوە؟ ها؟ بۆچی لەگەڵم خەوتیت هەی چەپەڵ؟ بۆ هاتیتە ناو نوێنەکەمەوە؟

فرێد: بۆ خۆشم نازانم شەیتان ئەمەی بۆچی پێکردم.

لیزێ (بەدەم گریانەوە دەکەوێتە سەر کورسییەك): چەپەڵی پیس! گەمژە!





فرێد: پێنج سەد دۆلار! ئەم فینگەفینگەت لە چییە.. چیی ترت دەوێ.. پێنج سەد دۆلار! بیبڕەوە، لیزێ، لیزێ عاقڵ بە! پێنج سەد دۆلار!

لیزێ (بەدەم هەنسکی گریانەوە): من عاقڵ نیم. ئەم پێنج سەد دۆلارەی تۆشم ناوێ، نامەوێ شایەدیی بە درۆ بدەم. دەمەوێ بگەڕێمەوە بۆ نیوویۆرك‌و بڕۆمەوە کاولبووەکەی خۆم. (زەنگی دەرگا. لیزێ بە دەنگێکی نزم). چییە ئەمە؟ کوا وس بە! (زەنگێکی دووردرێژ لە دەگاکەوە). دەرگا ناکەمەوە. بێدەنگ بمێنەوە. (بە کۆڵەمست لە دەرگا دەدەن).

دەنگێك: دەرگا بکەوە، پۆلیسە.

لیزێ (بە دەنگێکی نزم): پۆلیس. دەمزانی دێن. (بازنەکەی پیشان دەداتەوە). ئەمە هەمووی لە سۆنگەی ئەو بەسەر من دێ. (دادەنوشتێتەوەو بازنەکە دەکاتەوە مەچەکی). چی دەبێ با ببێ،

باشتر وایە بیکەمەوە مەچەکم. خۆت بشارەوە.

(بە کۆڵەمشت لە دەرگا دەدەن).

دەنگەکە: پۆلیسە!

لیزێ: دە تۆ خۆت بشارەوە. بچۆرە توالێتەکەوە.

(فرێد لە جێی خۆی جووڵە ناکا. لیزێ بە هەموو هێزی خۆی پاڵی پێوە دەنێ). دە بڕۆ! بڕۆ دەی!

دەنگەکە: فرێد لەوێی؟ لێرەی تۆ، فرێد؟

فرێد: لێرەم.

(فرێد خۆی لە دەست لیزێ رادەپسکێنێ. لیزێ گەمژە گەمژە تەماشای دەکا).

لیزێ: کەواتە ئەمەت لەژێر سەردا بوو!

(فرێد دەچێ دەرگا دەکاتەوە. جۆن و جێمس دێنە ژوورەوە).





# دیمەنی سێیەم

## لیزێو فرێد، لەگەڵ جۆن و جێمس

دەرگاکە هەر لەسەر پشتە.

جۆن: ئێمە پۆلیسین. تۆ لیزێ ماك کای؟

لیزێ (بێ ئەوەی گوێی لەمان بێ، هەر تەماشای فرێد دەکا): بۆ ئەم بەزمە هاتیتە لای من!

جۆن (شانی لیزێ دەگرێت و رایدەوەشێنێ): کە پرسیارێکت لێدەکەن، وەڵام بدەوە!

لیزێ: ها؟ بەڵێ منم.

جۆن: ناسنامەکەت.

لیزێ (بە زەحمەت توانیویەتی دان بە خۆیدا بگرێ): بە چ هەقێك تۆژینەوە لەگەڵ من دەکەن؟ هاتوونەتەماڵەکەم چیتان دەوێ؟

(جۆن ئەستێرەکانی پۆلیسیی خۆی نیشان دەدا). هەرکەسێك دەتوانێ ئەم تانج و نەجمانە لە خۆی ببەستێ. ئێوە هەردووکتان برادەری ئەمن و رێککەوتوون لەسەر ئەوەی منیش

بگلێننه ناو فرۆفێڵەکەی خۆتانەوە.

(جۆن ناسنامەکەی خۆی دەخاتە بەر لووتی لیزیّ).

جۆن: دەزانی ئەمە چییە؟

لیزیّ (دەست بۆ جێمس درێژ دەکا): ئەدی ئەم؟

جـۆن (روو دەکاتــه جـێمس): ناسـنامەکەی خـۆتی پیشان بدە!

(جـێمس ناسـنامەکەی پیـشان دەدا. لیـزیّ تەماشـای دەکــا. دەچــێتە لای مێزەکــه بــێ ئــەوەی هــیچ بڵــێ. ناسنامەکەی خۆی دەردەهێنێتو دەیانداتێ. له فرێد ورد دەبێتەوە).

جۆن: تۆ دوێنێ شەو ئەم پیاوەت هێناوەتـە ماڵـەوە. خۆشت باش دەزانـی پیـاو بـۆ ئـەم جۆرە ئیـشه بهێنیته ماڵەوە، سزای خۆی هەیە.

لیـزیّ: ئێـوه بـه تـەواوەتی دڵنیـان لـەوەی کـه مـافی خۆتانــه بــه بــێ هــیچ پرسـێك هەڵکوتنــه ســەر مـــاڵی خـــەڵك؟ لـــەوە ناترســـن مـــن تووشـــی چورتمێکتان بکەم؟





جۆن: تۆ ئێمه تووشی هیچ ناکـەی. (بێدەنگییـەك).

ئێمه تەنیا ئەوەمان له تۆ پرسیوه ئایـا تـۆ ئـەم پیاوەت لەگەڵ خۆت هێناوەتەوە ماڵ یا نا.

لیزیّ (لەوەتـەی پۆلیـسەکان هاتوونەتـه ژوور، لیـزیّ گۆڕاوە، سەرسەختترو جامبـازتر بـووە): سـەری خۆتـان ئەوەنـدە بـەم پرسـیارە مەیەشـێنن. بـا. لەگەڵ خۆمم هێنایەوە ماڵ. بـەڵام بـه خـۆڕایی لەگـەڵی نووسـتووم، پـارەم لێـی وەرنـەگرتووە. باشه!

فرێـد: دوو پارچـەی ده دۆلاری، کـه لەسـەر مێزەکـه داندراون.. هی من بوون لەوێم داناون.

لیزیّ: بیسەلمێنه!

فرێد (بێ ئەوەی تەماشای لیزیّ بکا، رووی لەوانـه): دوێنێ بـەیانی لـه بانقەکـەی خـۆم رامکێـشاون. بیــستو هەشــت پارچــەی دیکەشــم پێیــه کــه ژمارەکانیان هەمان زنجیرەن. دەتوانن بەراوردی ژمارەکانیان بکەن.

لیزیْ (هەڵدەچیْ): من رازی نەبووم وەریان بگرم.
من رازی نەبووم ئەم کاغەزە پیسانەی ئەو
وەربگرم. بە دەموچاویم دادانەوە.
جۆن: ئەگەر رازی نەبووی وەریانبگری، ئەدی چۆن
هێشتا هەر لەسەر مێزەکەتن؟
لیزیْ (دوای بێدەنگییەك): نازانم چیتان پیْ بڵێم!
(لیزیْ تەماشای فرێد دەکاتو مۆڕەی لێدەکات.
پاشان بە دەنگێکی وەك بڵێی نەرمو نیان).
ئەمەت لەژێر سەردا بوو، ها؟ (روو دەکاتە
پۆلیسەکان). باشە ئێستا ئێوە چیتان لە من
دەویْ؟
جۆن: دانیشە! (روو دەکاتە فرێد) مەسەلەکەت تێی
گەیاندووە؟ (فرێد بە سەر وەڵامیان دەداتەوە).
پێت دەڵێم دانیشە! (جۆن لێزیْ فڕیْ دەداتە ناو
کورسییە قەنەفەکەیەوە). دادوەر رازییە تۆماس
بەر بدا ئەگەر تۆ بە نووسین شایەدی بدەی.
ئێمە کاغەزەکەمان بۆت نووسیوە.. تۆ تەنیا





ئیمزایەکی دەکەیتو تەواو. سبەینیْ دیسان
دێنەوە لاتو قسەت لەگەڵ دەکەنەوە.
خوێندەواریت هەیە؟ (لیزیْ شان هەڵدەتەکێنیْ.
جۆن کاغەزەکەی بۆ دەخاتە بەردەمی).
بیخوێنەوەو ئیمزایەکی بکە!
لیزیْ: لە سەرەتاوە تا کۆتایی هەمووی درۆی
هەڵبەستراون.
فرێد: ئەگەر واشبیْ. دوای ئەوە چی؟!
لیزیْ: من ئیمزای ئەمە ناکەم.
فرێد: بە پێش خۆتانی بدەن (روو دەکاتە لیزیْ).
هەژدە مانگ حەپس!
لیزیْ: هەژدە مانگ حەپس. باشە. بەڵام کە دێمە
دەرەوە، خۆت دەبینیتەوە.
فرێد: چیت لەدەست دیْ بیکە (هەردووکیان
تەماشای یەکتر دەکەن. فرێد روو دەکاتە
پۆلیسەکان). وا بزانم ئێوە دەبیْ تەلەفونێك بۆ
نیوویۆرك بکەن، چونکە وا بزانم لەوێش

گیروگرفتو مەلەفی هەیە.

لیزێ (بە خۆپەسەندییەوە): لە ژنێك بە ئایینو ئۆێنتری. هەرگیز باوەڕم نەدەكرد پیاوێك بتوانێ هێندە چەپەڵ بێ.

جۆن: بڕیار بدە. ئیمزا دەكەی یان دەست بە كەلەپچەوە بتبەم؟

لیزێ: كەلەپچەكەم پێ باشترە، نامەوێ درۆ بكەم.

فرێد: ناتەوێ درۆ بكەی هەی..! ئەدی دوێنێ شەو بە درێژایی ئەو كاتە هەر چیت دەكرد؟ كاتێ پێت دەگوتم "ئازیزەكەم" "خۆشەویستەكە" "پیاوە شیرینەكەی خۆم" ئەدی ئەمانە هەموو درۆی تۆ نەبوون؟ كاتێ ئاخو ئۆفت رۆژەڕێیەك دەڕۆیشت بۆ ئەوەی وام تێبگەیەنیت كە ئی منت پێ خۆشە.. تۆ ئەو كاتانە درۆت نەدەكرد؟

لیزێ (بە دڵنیاییەوە): نەخێر. من درۆم نەدەكرد.

(تەماشای یەكتر دەكەن. فرێد چاوی لەسەر چاوی لادەبا)





فرێد: دە یەڵڵا، با كۆتایی پێ بێ. هانێ بە قەڵەمەكەی من، ئیمزای بكە!

لیزێ: دەتوانی قەڵەمەكەت بخەیتەوە باخەڵت.

(لەناو بێدەنگیدا، هەرسێ پیاوەكە تەماشای یەكتر دەكەنو چاش ماون).

فرێد: بزانە تووشی چی هاتووین.. لەگەڵ ئەم..! پیاوێكی گەورەو گرانی ئەم شارە چارەنووسی كەوتۆتە دەست كێ؟

فرێد (بە درێژیو پانیی ژوورەكە دێتو دەڕوا. لەناكاو دەگەڕێتەوە لای لیزێ): تەماشا كە! (فرێد وێنەیەكی پیشان دەدا). تۆ لەناو ئەم ژیانە چڵپاوەی خۆتدا گەلێك پیاوت دیوە، بەڵام هەرگیز پیاوی ئاوهات دیوە؟ تەماشای ئەم نێوچەوانەی بكە، تەماشای ئەم چەناگەیەی، تەماشای ئەم هەموو مەدالیایە لەسەر یەخەی. نا، نا، چاوت لەسەریان لا مەبە. تەماشای هەمووی بكە، ئەم پیاوە شكۆمەندە دەبێتە

قوربانیی تۆ. دەبێ تەماشای بکەی رووبەڕوو. دەیبینی چەند گەنجە، چەند شکۆدار، چەنێك کەشخە! ئینجا دڵنیابە، کاتێ لە حەپسخانە دێتە دەرەوە، دوای دە ساڵ، عەینەن پیرەمێردێکی لێهاتووە، قژی هەڵوەریوەو ددانەکانیشی زۆربەیان کەوتوون. تۆ بەمە دڵت خۆش دەبێ؟ ئەمە کارێکی باشە تۆ بیکەی؟ تۆ تاکو ئێستا پارەت لە گیرفانی خەڵك دەدزی، ئەمجارە باشترین پیاوت هەڵبژاردووەو دەتەوێ ژیانی ئەو بدزی؟ هیچیش ناڵێی، ها؟ ئەم بۆگەنبوونەی تۆ گەیشتۆتە ئێسقانەکانیشت، ها؟ (فرێد لیزێ دەخاتە سەر چۆك) چۆك دابدە، هەی سۆزانی! چۆك دابدە بەرامبەر وێنەی ئەو پیاوەی کە تۆ دەتەوێ حەیای ببەی!

(کلارك لە ناو دەرگاکەوە دێتە ژوورەوە).





## دیمەنی چوارەم

### هەمان کەسەکان، لەگەڵ سناتۆر (کلارك)

سیناتۆر: وازی لێبێنە. (روو دەکاتە لیزێ) هەستەوە!

فرێد: هەلاو.

جۆن: هەلاو.

سیناتۆر: هەلاو، هەلاو.

جۆن (رووی لە لیزێ): ئەمە سیناتۆرە، مستەر کلارك.

سیناتۆر( رووی لە لیزێ): هەلاو.

لیزێ: هەلاو.

سیناتۆر: باش. یەکتری ناسین تەواو بوو (تەماشای لیزێ دەکا). ئەمەیە کچەکە! ئادگارێکی زۆر جوانیشی هەیە.

فرێد: نایەوێ ئیمزا بکا.

سیناتۆر: بە تەواوەتی هەقی خۆیەتی. ئێوە هەمووتان لێی بە ژوور کەوتوون بە بێ ئەوەیش

کــە مــافی ئــەوەتان هــەبێ (بــە تووڕەییــەوە ئاماژەیـەك بـۆ جـۆن دەكـا) ئێـوە هـیچ مـافێکی ئەوەتان نییـە، ئێـوە زۆری لێدەکەنو دەتانـەوێ پێ لە ویژدانی خۆی بنێت. ئـەم جۆرە رەفتـارە هی ئەمریکییەکان نییە. ئـیش چۆن وا دەبـێ؟!
رۆڵە ئازیزەکەم.. کابرای قولەڕەش تەعەددای لە تۆ کردووە؟

لیزێ: نەخێر.

سیناتۆر: تەواو. ئاشکرایە. تەماشـای نـاو چـاوم بکـە (سیناتۆر تەماشای دەکا). مـن دڵنیـام درۆ ناکـا. (بێدەنگییــەك). قــوڕ بەســەر مــاری. (روو دەکاتـەوە ئـەوانی دیکـە) تـەواو، کوڕینـە. ئێمـە هیــچمان نــەماوە لێــرە بیکــەین. دەی. داوای لێبوردن لەم خانمە بکەینو.. بڕۆین.

لیزێ: ماری کێیە؟

ســیناتۆر: مــاری؟ خوشــکەکەمە، دایکــی تۆماســی بەدبەخت. پیرەژنێکی بەستەزمان، بـەخوا هـەر بە سك دەدا. خوات لەگەڵ رۆڵەکەم.





لیزێ (بە دەنگێکی نووساوەوە): جەنابی سیناتۆر!

سیناتۆر: رۆڵە گیان!

لیزێ: داوای لێبوردنت لێدەکەم.

سیناتۆر: تۆ بۆچی خەفەت بەمە دەخۆی بابە گیان، تۆ راستییەکەت بە ئێمە گوت.

لیــزێ: مــن خەفــەت بــۆ ئــەوە دەخــۆم کــە ئــەم راستییە.. ئەم راستییە ببێتە هۆی..

سیناتۆر: ئێمـە هـیچ کەسێکمان، هـیچ کەسێك، مـافی ئـەوەی نییـە داوا لـە تـۆ بکـا شـایەدیی بـە درۆ بــدەی. (بێدەنگییــەك). نــا. خــەمی ئــەو ژنــە بەستەزمانەت نەبێ. نا.

لیزێ: خەمی کێم نەبێ؟

سیناتۆر: خەمی خوشکەکەی من، دایکی تۆماس. تـۆ خەمی خوشکەکەی منت نییە؟

لیزێ: با.

ســیناتۆر: مــن بــاش ئەمــە دەزانم، رۆڵەکـەم. حـەز دەکەی پێت بڵێم کە چ شتێك لـەناو سـەری تـۆ

دەخوولێتەوەو چ شتێك بە خۆت دەڵێی؟ (وەکو لیزێ قسە دەکاتو دەمەلاسکەی دەکاتەوە) "ئەگەر ئێستا ئیمزای بکەم، سیناتۆر یەکسەر دەچێتە لای ئەو پیرەژنەی دایکی تۆماسو پێی دەڵێ: لیزێ مارکای کچێکی زۆر میهرەبانە، ئەو بوو کە کوڕەکەی تۆی رزگار کرد". ئەو کاتە پیرەژنەش لە توێی فرمێسکەکانیەوە دەگەشێتەوەو شاگەشکە، دەڵێ "لیزێ ماك کای؟ من هەرگیز نابێ ئەم ناوە لەبیر بکەم". ئێ منیش، بێکەسو بێکار کە چارەنووس ئاوها تووڕی هەڵداومەتە ژێر قاچەکانی کۆمەڵگەوە، لەمەودوا ژنێکی بەناوساڵکەوتووی میهرەبان، هەمیشە لە ماڵەکەی خۆیدا منی لەبیر دەبێتو.. چەند خۆشە دایکێکی ئەمریکایی لەناو دڵی خۆیدا داڵدەم بدا!". ئای لیزێی بەستەزمان. چیتر بیری لێ مەکەوە. دەی!

لیزێ: ئەو ژنە سەری سپی بووە؟





سیناتۆر: سپی سپی سپی. بەڵام دەموچاوی دەڵێی گوڵە. خۆزگە زەردەخەنە نازدارەکانیت دەبینی.. بەڵام تەواو، ئەو خۆ چیتر زەردەخەنەی ناکەوێتەوە سەر لێو! خوات لەگەڵ. سبەینێ راستییەکە چییە لە دادگا بیڵێو تەواو.

لیزێ: دەڕۆن؟

سیناتۆر: ئەدی چ بکەین، با بچم هیچ نەبێ سەرێکی لێبدەم. دەچم ئەم قسانەی بۆ دەگێڕمەوە.

لیزێ: ئەو دەزانێ تۆ لێرەی؟

سیناتۆر: من لەسەر داخوازیی ئەو هاتبووم بۆ لای تۆ، دەپاڕایەوە بەستەزمانە.

لیزێ: خوایە! یەعنی ئەو چاوەڕێی وەڵامی من دەکاتو تۆش دەچی پێی دەڵێی کە من رازی نەبووم ئیمزای بکەم؟ ئێستا رقی دنیای لە من هەڵدەستێ.

سیناتۆر (دەست لەسەر شانی لیزێ دادەنێ): رۆڵە

بەستەزمانەکەم؛ ئەم هەڵوێستەی تۆ بە حاڵی کەس نەبێ.

لیزێ: چیم بەسەر هات! (روو لە بازنەکەی دەکا) هەموو خەتای تۆیە، هەی پیسی!

سیناتۆر: چۆن؟

لیزێ: هیچ. (بێدەنگییەک). ناخۆشییەکە لەوەدایە کە کابرای قولەڕەش هیچ تەعەددایەکی لێ نەکردووم.

سیناتۆر (گەشاوەتەوە): رۆڵەکەی خۆم..

لیزێ (بە غەمگینییەوە): خۆزگە تەعەددای لێ کردمایە، لەو کاتەدا من تەنیا ئازارێکی کەمم دەچەشت، بەڵام ئێوەومانان دڵتان زۆر زۆر خۆش دەبوو.

سیناتۆر: سوپاس. (بێدەنگییەک). چەند حەزم دەکرد یارمەتیتان بدەم. (بێدەنگییەک). بەڵام مخابن! راستی راستییە.

لیزێ (بە خەفەتەوە): ئێ چی بکەم!





سیناتۆر: راستییەکەش ئەوەیە کە قولەڕەش دەستی بۆ درێژ نەکردووی.

لیزێ (بە هەمان شێوە): ئێ چ بکەم؟

سیناتۆر: وایە (بێدەنگییەک) گرفتەکە لێرەدا کە ئەم راستییە پەیوەندیی بە راستییەکی گەورەترەوە هەیە.

لیزێ (بێ ئەوەی تێبگا): راستییەکی گەورەتر..

سیناتۆر: بەڵێ؛ مەبەستم ئەوەیە بڵێم راستییەک کە پەیوەندیی بە هەموو میللەتەوە هەیە.

لیزێ: میللەت؟ یەعنی ئەمەی من راستی نییە؟

سیناتۆر: با. با. راستییە. بەڵام راستییەکان چەندین جۆریان هەیە.

لیزێ: تۆ وا تێدەگەی کە قولەڕەشەکە تەعەددای لێکردووم؟

سیناتۆر: نا، نەخێر، تەعەددای لێنەکردووی. لە هەندێک رووەوە تەعەددای لێنەکردووی، بەڵام تۆ تەماشاکە، من پیاوێکی بەتەمەنم و دنیام زۆر

دیوەو زۆریش کەوتوومەتە هەڵەوە، بەڵام چەند ساڵێکە کەمتر دەکەومە هەڵەوە. من لەم بارەیەوە، بە تەواوەتی لەگەڵ راکەی تۆدا نیم.

لیزێ: رای من.. کام؟

سیناتۆر: چۆنت بۆ باس بکەم؟ بەڵێ. تۆ بێنە پێش چاوت، هەموو نەتەوەی ئەمریکا لەناکاو لە بەردەمت هەڵبستێتەوە. چیت پێ دەڵێ. دەزانی؟

لیزێ (زەندەقی چووە): من وا تێدەگەم هیچی نییە بە منی بڵێ.

سیناتۆر: جارێ پێم بڵێ تۆ شیووعیت؟

لیزێ: قوڕ بەسەرم. نەخێر.

سیناتۆر: کەواتە، نەتەوەی ئەمریکا زۆر شتی هەیە بە تۆی بڵێ. پێت دەڵێ: "لیزێ، تۆ کەوتوویتەتە حاڵەتێکەوە کە لە نێوان دوو لە رۆڵەکانی من یەکێکیان هەڵبژێریت. یەکێك لەوان دەبێ لەناو بچێ. لەو حاڵەتەدا ئینسان چ





دەکا؟ بێگومان باشترەکەیان هەڵدەبژێرێ. کەواتە ئێستا دەبێ سۆراغ بکەین کامەیان باشترەکەیە. وا نییە؟".

لیزێ: وایە. من زۆر حەز دەکەم. ئە .. ببوورە. وامدەزانی تۆی قسەم لەگەڵ دەکەی.

سیناتۆر: من بە ناوی نەتەوەی ئەمریکاوە قسەت لەگەڵ دەکەم (دەست پێدەکاتەوە) "لیزێ، باشە ئەم قولەڕەشەی تۆ بەرگریی لێدەکەی، بەکەڵکی چی دێ؟ خوا دەزانێ بە رێککەوت لە کوێ لەدایك بووە. من ئەوا بەخێویم کرد، بەڵام ئەو لە پاداشتی ئەمەدا چیی بە من دەبەخشێ؟ هیچ. خوێڕی خوێڕی بەملاو بەولادا دەسووڕێتەوەو گۆرانی دەڵێو هەر دەزانێ کراسی سەوزو سوورم بۆ لەبەر بکا. راستە ئەویش کوڕی خۆمەو خۆشیم دەوێ، بەڵام من لێت دەپرسم: ئایا بەشەر ئاوها دەبێ.. ئاوها دەژی؟ ناوەڵا گوێم لەوە نییە تەنانەت بشمرێ".

لیزێ: چەند جوان قسە دەکەی، جەنابی سیناتۆر!

سیناتۆر (قسەی تری بەدەمەوە دەدا): با بێینە سەر کوڕەکەی دیکەم، تۆماس، کە تەواو لەگەڵ ئەو جیاوازە. هاتووە قولەڕەشێکی کوشتووە.. ئەمە کارێکی خراپە، بەڵام من زۆر پێویستیم بەو هەیە. جگە لەمەش تۆماس لە سەددا سەد ئەمریکییەو کوڕی یەکێك لە بنەماڵە دێرینەکانی ئێمەیە، خوێندنی خۆی لە زانکۆی هارڤارد تەواو کردووە، فەرمانبەرێکی گەورەیە — ئێمە پێویستیمان بە فەرمانبەر هەیە — دوو هەزار کرێکار بەهۆی کارگەکەی ئەوەوە دەژینو کار دەکەن. ئەگەر تۆماس نەبێ ئەم دوو هەزار کرێکارە بێکار دەمێننەوە. تۆماس سەرۆکیانە، بەربەستێکی پتەوە دژی کۆمۆنیزمو سەندیکالیزمو جوولەکە. ئەو دەبێ بژیو تۆش دەبێ ژیانی ئەو بپارێزیت. تەواو. ئێستاش خۆت بڕیار بدەو هەڵبژێرە.





لیزێ: چەند جوان قسە دەکەی.

سیناتۆر: یەکێکیان هەڵبژێرە!

لیزێ (دەڵێی تازە لە خەو هەڵساوە): ئەم! ئێ.. بەڵێ.. (بێدەنگییەك). تۆ هێڕوهوڕت کردم. نازانم هەر لە کوێشم.

سیناتۆر: سەیرم بکە! لیزێ، تۆ متمانەت بە من هەیە؟

لیزێ: بەڵێ، سیناتۆر.

سیناتۆر: قەت باوەڕ دەکەی من بێم داوات لێبکەم کارێکی هەڵە بکەی؟

لیزێ: نەخێر، سیناتۆر.

سیناتۆر: کەواتە ئیمزا بکە. هانێ پێنووسەکەم.

لیزێ: دڵی خۆش دەبێ بەم کارەی من؟

سیناتۆر: کێ؟

لیزێ: خوشکەکەت.

سیناتۆر: ئەو هێشتا هەر لە دوورەوە بەقەد خوشکەکەی خۆی تۆی خۆش دەوێ.

لیزێ: ئینجا لەوانەیە گوڵێشم بۆ بنێریێ؟

سیناتۆر: بێگومان لەوانەیە.

لیزێ: یان وێنەیەکی خۆی بە ئیمزاوە.

سیناتۆر: زۆر لەوانەیە.

لیـزێ: ئینجـا وێنەکـەی بـە دیـوارەوە هەڵدەواسـم. (بێدەنگییەك. لیزێ هـەنگاو دەنێـتو شـڵەژاوە). تووشــی چــی هــاتم! (لیــزێ دەگەڕێتــەوە لای سیناتۆر). ئەگەر من ئیمزای بکەم، ئێوە چـی لـە قولەڕەشەکە دەکەن؟

سـیناتۆر: قولـەڕەش؟.. (شـانەکانی لیـزێ دەگـرێ). ئەگــەر ئیمــزا بکــەی، هــەر هــەموو شــار دێ باوەشـت پێـدا دەکـا. دڵـی هـەموو شـار خـۆش دەکەیتو هەرچی دایك هەن..

لیزێ: بەڵام.

سیناتۆر: بـەڵام چـی؟ تـۆ وا تێدەگـەی شـارێك هـەر هــەمووی سەرچــیخ چــووە لــە هەمبــەر ئــەم مەســـەلەیەوە؟ شـــارێك بـــە خـــۆیو هـــەموو





مــەتڕانو قەشــەکانی خۆیــەوە، بــە هــەموو پزیشكو پارێزەرو هونەرمەنـدەکانی خۆیـەوە؟ تۆ وا دەزانی سەرۆکی شارەوانیو ئەندامەکانیو ڕێکخـراوە خێرخوازەکـانیش هـەر بـە سـەهوو چوونە؟

لیزێ: نا. نەخێر. نا.

سیناتۆر: دەستت بێنـە (هێـزی خـۆی بـەکاردێنێ تـا لیــزێ ئیمــزا بکــات). تــەواو. بــە نــاوی خوشکەکەمەوەو کوڕەکەیشی، سوپاست دەکەم. بـە نـاوی حەڤـدە هـەزار مرۆڤـی سـپی پێـستی شارەکەمانەوە، بە ناوی نەتەوەی ئەمریکاوە کە مــن لێــرە نوێنــەریم. نێوچــەوانت بێنــە (نێوچــەوانی مــاچ دەکــا) وەرن، ئێــوە. (ڕوو دەکاتـەوە لیـزێ) ئـەم ئێوارەیـە لـە خوانەکـەدا دەتبینمەوە: قسەی دیکەمان هەیە بیکەین.

(سیناتۆر دەچێتە دەرەوە).

فرێد (دەچێتە دەرەوە): خواحافیز، لیزێ.

لیزێ: خوات لەگەڵ. (هەموویان دەچنە دەرێ. لیزێ داهێزراوە، پاشان بە پەلە رادەکاتە لای دەرگا).

سیناتۆر! مـن نامـەوێ ئیمـزا بکـەم! کاغەزەکـە بدڕێنـە! سـیناتۆر! حـەز ناکـەم! ئـەو کاغـەزە بدڕێنە! سیناتۆر! (لیزێ دەگەڕێتەوە ژوورەوە. بێ ئەوەی بیەوێ دەست دەداتە گسکماکینەکە). نەتەوەی ئەمریکا! (لیـزێ نائومێـدە). وا بـزانم کڵاویان لەسەر نام.

(لیزێ بە تووڕەییەوە گسکماکینەکە دەخاتە گەڕ).

(پەردە)





# تـابلۆی دووەم

هـەمان دیکـۆر. دووازدە کاتـژمێر دواتـر. گڵۆپـەکان داگیرسـاون، پەنجـەرەکان بەسـەر شـەودا کـراوەن. سەروسـەدای پیادەڕۆکـان دەبیـسترێ. لـە پەنجـەرەوە قولـەڕەش دەردەکـەوێ، بـە زەحمـەت سـەردەکەوێتە نـاو پەنجەرەکـەو خـۆی هەڵداوێتـە نـاو ژوورەکـەوە. دەگاتـە ناوەڕاسـتی دیمـەنی سـەر شـانۆ. زەنگـی دەرگـا لێـدەدرێ. قولـەڕەش دەچـێ لـە پـشتەوەی پەردەیـەك خـۆی دەشـارێتەوە. لیـزێ لـەناو حەمامەکـەی دێتـە دەرەوە، بەرەو لای دەرگا دەچێتو دەیکاتەوە.

## دیمەنی یەکەم

## لیزێ، سینـاتۆر، قولەڕەش کە خۆی شاردۆتەوە

لیزێ: فەرموو. (سیناتۆر دێتە ژوورەوە). ئا.. دەی!

سیناتۆر: تۆماس بە ئامێزی دایکی خـۆی شـاد بـۆوە. هاتووم سوپاسی ئەوانت پێبگەیەنم.

لیزێ: دڵی خۆشە، دایکەکەی؟

سیناتۆر: دڵی هەر یەکجار خۆشە.

لیزێ: دەگریا؟

سیناتۆر: بگریەت، بۆ؟ ئەو ژنێکی زۆر بەهێزە.

لیزێ: تۆ بە منت گوت کە دەگریا.

سیناتۆر: قسە بوو.

لیزێ: چاوەڕێی ئەوەی نەدەکرد، ها؟ ئەو وایدەزانی کە من ژنێکی خراپم‌و دەچم لە بەرژەوەندیی قولەڕەشەکەدا شایەدی دەدەم؟

سیناتۆر: ئەم مەسەلەیە، لای ئەو، بە دەست خوا بوو.

لیزێ: رای چییە بەرامبەر من؟

سیناتۆر: سوپاست دەکا.

لیزێ: هیچ نەیپرسی کە من ئافرەتێکی چۆنم؟

سیناتۆر: نەخێر.

لیزێ: هیچ باسی ئەوەی نەکرد کە من ئافرەتێکی دلۆڤانم.

سیناتۆر: ئەو دەزانێ کە تۆ ئەرکی خۆتت جێبەجێ





کردووە.

لیزێ: بەڵێ..

سیناتۆر: ئومێدەواریشە کە بەردەوام بیت..

لیزێ: بەڵێ، بەڵێ..

سیناتۆر: تەماشاکە، لیزێ. (شانی دەگرێ). تۆ بەردەوام دەبیت لەسەر ئەرك‌و ئەمەکی خۆت، وا نییە؟ ئەم دایکەمان بێ ئومێد ناکەیت؟

لیزێ: خۆت سەغڵەت مەکە. تاقەتم نییە چیتر بێمەوە سەر ئەو شتانەی باسمان کرد، ئەگینا دێن دەمگرن‌و دەمهاوێنە حەپسخانەوە. (بێدەنگییەك). ئەرێ ئەو هەرایە چییە لە دەرەوە؟

سیناتۆر: چ نییە.

لیزێ: ناتوانم گوێم لەم هەموو هاتوهاوارە بێ. (دەچێ پەنجەرەکە دادەخا). سیناتۆر!

سیناتۆر: رۆڵەکەم!

لیزێ: تۆ دڵنیای کە ئێمە لەو کارەی کردمان

سەرچیخ نەچووینەو من ڕاست بووم لەوەی کردم؟

سیناتۆر: بە دڵنیاییەوە.

لیزێ: من خۆ بۆ خۆم سەر لەم جۆرە شتانە دەرناکەم. تۆش سەرسامت کردم؛ زۆر بە پەلە پەل قسەت بۆم دەکرد. سەعات چەندە؟

سیناتۆر: یانزە.

لیزێ: هێشتا هەشت سەعاتی ماوە ڕۆژ بێتەوە. هەست دەکەم ئەمشەو نەتوانم بنووم. (بێدەنگییەك). شەوان دنیا بەقەد ڕۆژ گەرمە. (بێدەنگییەك). ئەدی ئەو قولەڕەشە؟

سیناتۆر: کام قولەڕەش؟ ئا. ئێ. هەر بە دوایدا دەگەڕێن.

لیزێ: بیگرن چیی لێدەکەن؟ (سیناتۆر شان هەڵدەتەکێنێ. هاتوهاوارەکە بەرزتر دەبێتەوە. لیزێ ڕووەو پەنجەرەکە دەڕوا). باشە ئەم هەرایە چییە؟ کۆمەڵێك پیاو سەگیان پێیەو





دەست بە بلاجکتۆرەوە تێدەپەڕن. ئەم ناوە بۆتە چراخان. یان شتێك قەوماوە.. پێم بڵێ سیناتۆر، چییە ئەمە؟ پێم بڵێ چی قەوماوە؟

سیناتۆر (نامەیەك لە بەرکی خۆی دەردێنێ): خوشکم داوای لێکردم ئەمەت بدەمێ.

لیزێ (دەگەشێتەوە): نامەی بۆ نووسیوم؟ (زەرفی نامەکە هەڵدەپچڕێنێ. سەد دۆلارییەك دەردەهێنێ. دەگەڕێ بەدوای نامەیەك، نایدۆزێتەوە. زەرفی نامەکە لەناو چنگی خۆیەوە توور هەڵدەداتە سەر ئەرزەکە. دەنگی دەگۆڕێ). سەد دۆلار. ئێوە دەبێ دڵتان زۆر خۆش بێ، چونکە کوڕەکەتان بەڵێنی پێنج سەد دۆلاری بە من دابوو. پاشەکەوتێکی باش بۆ خۆتان دەکەن.

سیناتۆر: ڕۆڵە گیان.

لیزێ: ئێوە سوپاسی خوشکە خانمی خۆتان بکەن. پێیان بڵێ کە من وام بە باشتر دەزانی

دیارییەکی بچکۆلە، یان جووتە گۆرەوییەك، هەرچی شتێکی خۆی هەڵیبژاردایە، بۆی ناردبام. خۆت دەزانی ئەم جۆرە دیارییانە دڵی مرۆ خۆشتر دەکەن. (بێدەنگییەك). ئێوە باش کڵاوتان لەسەر من نا.

(تەماشای یەکتر دەکەن. سیناتۆر نزیکی دەکەوێتەوە).

سیناتۆر: سوپاست دەکەم، رۆڵەکەم. پاشان منو تۆ پێکەوە خۆمو خۆت هەندێ قسە لەگەڵ یەکتر دەکەین. دۆخی دەروونیی تۆ زۆر باش نییە، پێویستیت بە پشتیوانیی من هەیە.

لیزێ: من تەنیا پێویستیم بە پارە هەیە، بەڵام وا بزانم دەتوانم ئەمەش چارەسەر بکەم، ئەمەش بە هیممەتی تۆ. (بێدەنگییەك). تاکو ئەمڕۆ، من پیاوی بەتەمەنم بە باشتر دەزانی، چونکە بەڕێزترن. بەڵام خەریکە لە خۆم دەپرسم: ئاخۆ ئەوانیش لە گەنجەکان قرچۆکتر نین؟





سیناتۆر: قرچۆك؟ چەند حەزم دەکرد هاوکارەکانی من ئەم قسەیەی تۆیان گوێ لێ بووایە. سروشتێکی چەند خۆشت هەیە! شتێك لە شەخسیەتی تۆدا هەیە کە فەوزای ژیان هێشتا دەستی پێی نەگەیشتووە. (دەیلاوێنێتەوە). بەڵێ. ئا. شتێك.

(لیزێ بێ ئەوەی سەغڵەتی بکاتو خۆی لە دەستی راپسکێنێ، وازی لێهێناوە دەست بە سەریدا بهێنێ).

سیناتۆر: ئێستا دەگەڕێمەوە، بە دوامدا مەیە.

(سیناتۆر دەچێتە دەرێ. لیزێ لە جێگەی خۆی وشك دەمێنێتەوە. پارچەی سەد دۆلارییەکە لەناو چنگی خۆیدا هەڵدەپشێوێو پاشانفڕێی دەداتە سەر زەوییەکە. ئینجا دەکەوێتە سەر کورسییەكو دەداتە پڕمەی گریان. لە دەرەوەش، هاتوهاوارەکە نزیك دەکەوێتەوە. دەنگی تەقە لە دوورەوە دێ. قولەڕەشەکە لە پشت پەردەکەوە دێتە دەرێ. لە بەردەم لیزێ رادەوەستێ. لیزێ سەر بەرز دەکاتەوەو دەقیژێنێ).

# دیمەنی دووەم

## لیزێو قولەڕەش

لیزێ: ها! (بێدەنگییەك. هەڵدەستێتەوە). دەمزانی دێیتەوە. دڵنیا بووم. تۆ لە کوێوە هاتیتە ژوورەوە؟

قولەڕەش: لە پەنجەرەکەوە.

لیزێ: چیت دەوێ؟

قولەڕەش: بمشارەوە.

لیزێ: پێم گوتی "نا".

قولەڕەش: گوێت لێیانە، خانم؟

لیزێ: بەڵێ.

قولەڕەش: دەستیان کردۆتەوە بە راوکردن.

لیزێ: راوی چی؟

قولەڕەش: قولەڕەشان راودەکەن.

لیزێ: ئەھ! (ماوەیەك بێدەنگی). تۆ دڵنیای کە تۆیان نەبینیوە کاتێ هاتیتە ژوورەوە؟

قولەڕەش: دڵنیام.





لیزێ: بتگرن، چیت لێدەکەن؟

قولەڕەش: بەنزین.

لیزێ: چی؟

قولەڕەش: بەنزین. (بە دەست ئاماژەی بۆ دەکاتو بۆی روون دەکاتەوە). بەنزینم پێدا دەکەنو دەمسووتێنن.

لیزێ: تێگەیشتم. (بەرەو پەنجەرەکە دەڕواتو پەردەکان دادەداتەوە). دانیشە. (قولەڕەش ماندوو خۆی داوێتە سەر کورسییەكو دادەنیشێ). باشە دەبووایە هەر بێیتەوە لای من؟ ئەم گرفتە لە کۆڵ من نابێتەوە. (لیزێ هێندەی نەماوە هەڕەشەی لێبکا). تۆ خۆت دەزانی من زەندەقم لە شەڕوشۆڕ دەچێ. (پێ دەکوتێتە سەر ئەرزەکە). هەترەشم لە شەڕ دەچێ. دەترسێم.

قولەڕەش: ئەمانە وا دەزانن کە من ئەزیەتی تۆم داوە، خانم.

لیزێ: ئێ؟

قولەڕەش: نایەن لێرە بە دوای مندا بگەڕێن.

لیزێ: تۆ دەزانی بۆچی دەیانەوێ "راوت" بکەن؟

قولەڕەش: چونکە وا تێدەگەن من دەسدرێژیم کردۆتە سەر ئێوە.

لیزێ: تۆ دەزانی کێ وای تێگەیاندوون؟

قولەڕەش: نەخێر.

لیزێ: من بووم. (بێدەنگییەکی زۆر. قولەڕەش هەر تەماشای دەکا). چۆنی تێدەگەی؟

قولەڕەش: بۆچی ئاوهات پێگوتن، خانم؟ توخوا، بۆ؟

لیزێ: منیش لە خۆم دەپرسم: بۆ؟

قولەڕەش: ئیدی تەواو هیچ بەزەییەکیان بە مندا نایەتەوە، دەکەونە سەر لاشەم، بەنزینم پێدا دەکەنو دەمسووتێنن. ئۆف. ئێ باشە خۆ من هیچم لێت نەکردبوو. بۆچی ئاوهاتان لێکردم، توخوا؟





لیزێ: ئۆف! با. تۆ دەستدرێژیت کردۆتە سەرم. تۆ نازانیت چ دەستدرێژییەکت کردۆتە سەرم. (بێدەنگییەك). لەمە زیاتر دەتەوێ بشمخنکێنی؟

قولەڕەش: ئەمانە عادەتیانە وا لە خەڵك دەکەن پێچەوانەی بیرکردنەوەی خۆی قسە بکات.

لیزێ: وایە. زۆربەی جار. کاتێ ناشتوانن هێز بەکار بهێنن، دێن بە فرتوفێڵ گێژوویژت دەکەن. (بێدەنگییەك). ئێ؟ دەی.. نایەی بمخنکێنی؟ تۆ پیاوێکی باشیش دیاری. (بێدەنگییەك). بزانە، تا سبەی ئێوارە لێرە لەلای خۆمت دەشارمەوە. (قولەڕەش جووڵەیەك دەکا) دەستم لێمەدە: من خەڵکی قولەڕەشم خۆش ناوێ. (لە دوورەوە دەنگی گوللەو هاتوهاوارە). خەریکن نزیکتر دەکەونەوە. (لیزێ بەرەو پەنجەرەکە دەچێ. پەردەکان باش دادەخاتو تەماشایەکی شەقامەکە دەکا). تەواو. ڕێکەوتینو بڕایەوە.

قولەڕەش: خەریکن چی دەکەن؟

لیزێ: ئەمسەرو ئەوسەری کۆڵانەکەیان بە پاسەوان گرتووەو سەرجەم ماڵەکان دەپشکنن. تۆ هەقت بووە رووت کردۆتەوە ماڵی من. بەڵام لەناو جاددەکەوە حەتمەن کەسێك تۆی هەر بینیوە کاتێ بە پەنجەرەکەمدا هەڵگەڕاوی. (لیزێ دیسان دەڕوانێتەوە ناو شەقامەکە). ئەمەتا. وا ریزەکە گەیشتە ئێمە. وا بەرەو ئێرە دێن، سەردەکەون.

قولەڕەش: چەند کەسن؟

لیزێ: پێنج شەشێکن. ئەوانی دیکە لە خوارەوە دەمێننەوە. (دەگەڕێتەوە لای قولەڕەش). زەندەقت نەچێ، مەلەرزە. خوایە! (بێدەنگییەك. رووەو بازنەکەی) هەی ماری نەفرەتلێکراو! (فڕێی دەداتە سەر زەوییەکەو دەیپلیشێنێتەوە). هیچوپووچ! (رووەو قولەڕەش) تۆ پێویست بوو بێیتە ئێرە؟





(قولەڕەش هەڵدەستێتەوەو دەیەوێ رابکا).

لیزێ: دانیشەوە. هەر لە جێگەی خۆت بجووڵێی، ئیشت دەقە!

قولەڕەش: ویستم غاردەمە سەر دەندەی بنمیچەکانەوە.

لیزێ: بەم مانگەشەوە؟ ئەگەر دەست لە گیانی خۆت هەڵدەگریت، بڕۆ! (بێدەنگییەك). با چاوەڕێ بکەین. هێشتا دوو قاتیان ماوە بگەنە ئێمە. پێم وتی ئەوەندە هەڵمەلەرزە لە ترسان. (بێدەنگییەکی زۆر. لیزێ بە درێژی‌و پانیی ژوورەکە دێت‌و دەچێ. قولەڕەش پلیشاوەتەوە لەسەر کورسییەکەی خۆیدا). تۆ هیچ چەکت پێ نییە؟

قولەڕەش: نا، نەخێر.

لیزێ: باش.

(لیزێ لە ناو چەکمەجەکەیەوە دەمانچەیەك دەردەهێنێ).

قولەڕەش: دەتەوێ چی بکەی، خانم؟

لیزێ: دەرگایان لێدەکەمەوەو تکایان لێدەکەم بێنە ژوورەوە. ئەمەتا، بیستو پێنج ساڵە، بە خۆیانو دایکە سەرسپیو قارەمانەکانی جەنگو نەتەوەی ئەمریکاوە، دایکی خێوی منیان سووتاندووە. بەڵام تازە تێگەیشتم، ئەم تەڵەکەبازییەیان لەگەڵ من بۆ ناچێتە سەر. دەرگاکەیان لێدەکەمەوەو پێیان دەڵێم: "ئەمەتا لێرەیە. لێرەیە بەڵام هیچ شتێکی نەکردووە؛ زۆریان لێکردم کە شایەدی بە درۆ بدەم. من سوێند بە خودا دەخۆم کە هیچ هەڵەیەکی بەرامبەر من نەکردووە".

قولەڕەش: ئەمانە باوەڕت پێناکەن.

لیزێ: با باوەڕم پێنەکەن. ئەگەر باوەڕیان پێنەکردم، تۆش پیاو بە بەم دەمانچەیە بیاندەرە بەر گوللە. ئەگەر هەر نەڕۆیشتن، هەر هەموو فیشەکەکانیان پێ بەتاڵ کە!





قولەڕەش: هی دیکە دێن.

لیزێ: ئەوانیش هەر بدەرە بەر گوللە. بە تایبەتیش ئەگەر کوڕی سیناتۆرت کەوتە بەرچاو، هەوڵ بدە ئەوت لەکیس نەچێ، چونکە ئەو ئەم هەموو بەزمەی ناوەتەوە. ئێمە تازە تێگلاوین. وا نییە؟ هەرچۆنێ بێ، ئەمە ئاخرین بەزمە بەسەر ئێمە دێ. چونکە، با پێت بڵێم، ئەگەر تۆ لای من بدۆزنەوە، ئەوا پێستی منیش دەبەنە دەباغخانە. کەواتە ئێستا با هەندێکیان لەتوپەت بکەینو پێکەوە بمرین. (لیزێ دەمانچەکەی دەداتێ). هانێ، بیگرە! پێت دەڵێم بیگرە دەست!

قولەڕەش: ناتوانم، خانمەکەم. ناتوانم.

لیزێ: چی؟ ناتوانی چی بکەی؟

قولەڕەش: ناتوانم هیچ سپی پێستێك بکوژم.

لیزێ: بە راست؟ بەڵام ئەوان خۆیان رێگە بە خۆیان دەدەن تۆ بکوژن.

قولەڕەش: ئاخر ئەوان سپی پێستن، خانم.

لیزێ: ئێ؟ سەبارەت بەوەی سپی پێستن، مافی ئەوەشیان هەیە بێن تۆ وەك بەرازێك بکوژن؟

قولەڕەش: ئەوان، چونکە، سپی پێستن.

لیزێ: بەدبەخت! دەزانی، تۆش عەینەن من وای، وەکو من گەمژەی.

قولەڕەش: بۆچی تۆ خۆت تەقەیان لێناکەی؟

لیزێ: من پێم وتی کە منیش وەکو تۆ بێ عەقڵم. (گوێمان لە دەنگی پێ دەبێ لەسەر قالدرمەکانەوە). ئەمەتا خەریکن دەگەن. (دەنگی پێکەنین دێ). دڵیشیان خۆشە. (بێدەنگییەك). راکە ناو توالێتەکەو جووڵە لە خۆت ببڕە! دەنگی هەناسەشت نەیە.

(قولەڕەش بە گوێی دەکا. لیزێ چاوەڕێیە. لە دەرگا دەدرێ. لیزێ نوێژێك لەسەر سنگی خۆی دەکا. بازنەکەی هەڵدەگرێتەوەو دەچێ دەرگا بکاتەوە. چەند پیاوێکی چەکدار دەردەکەون).





# دیمەنی سێیەم

## لیزێ، سێ پیاوە چەکدارەکە

چەکداری یەکەم: ئێمە بەدوای قولەڕەشەکەدا دەگەڕێین.

لیزێ: کام قولەڕەش؟

چەکداری یەکەم: ئەو قولەڕەشەی لەناو شەمەندەفەرەکە تەعەدای لە ژنێك کردبوو، ئینجاش نەوەی جەنابی سیناتۆریشی بە مووس بریندار کردبوو.

لیزێ: خوا عەقڵێکتان بداتێ پێی بەڕێوە بچن. ئێوە چۆن هاتوون ماڵی من دەپشکنن. (بێدەنگییەك) ئێمە من ناناسن؟

چەکداری دووەم: با. با. با. من جەنابتم بینی پێرێ کە لە شەمەندەفەرەکەوە دابەزینە خوارەوە.

لیزێ: تەواو. چونکە من ئەو ژنە بووم کە قولەڕەش تەعەدای لێم کردبوو. ئێستا حاڵی بوون؟

(پیاوە چەکدارەکان لەناو خۆیان دەکەونە پستەپستو گەمژانە تەماشای یەکتر دەکەن. مۆڕەیەك دەکەنو وردە وردە دەکشێنەوە). ئەگەر بێتە ئێرە، من بەم دەمانچەیە مێشکی دەپژێنم.

چەکدارێك: ئێوە حەز ناکەن ببینن بە پەتی سێدارەوە؟

لیزێ: هەر وەختێك دۆزیتانەوە، ئاگام بکەنەوە!

چەکدارێك: هێندەی نەماوە بیگرین، شیرینەکەی ئێمە. چونکە دەزانین هەر لەناو ئەم کۆڵانە خۆی شاردۆتەوە.

لیزێ: سەرکەوتوون.

(چەکدارەکان دەچنە دەرەوە. لیزێ دەرگاکە دادەخا. دەمانچەکە دادەنێتە سەر مێزەکە).





# دیمەنی چوارەم

## لیزێ، ئینجا قولەڕەش

لیزێ: ئێستا دەتوانی بێیتە دەرەوە. (قولەڕەش دێتە دەرەوە. دەکەوێتە سەر قاچەکانی لیزێو دامێنی رۆبەکەی ماچ دەکا). من پێم گوتی کە دەستم لێنەدەی. (لیزێ تەماشای دەکا). تۆ، سەرەڕای هەموو شتێك، دەبێ پیاوێکی زۆر ناوێزەش بیت، کە شارێکت ئاوها بە خۆتەوە مەژغوول کردووە!

قولەڕەش: من هیچم نەکردووە، خانم، خۆتان باش دەزانن.

لیزێ: ئەوان دەڵێن: "قولەڕەش هەمیشە شتێکی هەر کردووە".

قولەڕەش: هەرگیز، هیچ شتێکی خراپم نەکردووە. هەرگیز. هەرگیز.

لیزێ (دەست بە نێوچەوانی خۆیدا دەهێنێ): چەند

سەر دێنمو دەبەم، لە هیچ تێناگەم. (بێدەنگییەك). ناكرێ شارێك سەرتاپای بە سەهوو چووبن. (بێدەنگییەك). گوو بەم وەزعە. هیچی لێتێناگەم.

قولەڕەش: ئاوهایە خانم، هەمیشە لەگەڵ ئەمانە، ئاوهات بەسەر دێ.

لیزێ: تۆش، تۆش هەست دەكەی كە بە راستی لەوانەیە شتێكت كردبێ؟

قولەڕەش: بەڵێ، خانم.

لیزێ: هیچیشت نەكردووە؟

قولەڕەش: بەڵێ، خانم.

لیزێ: باشە بەڵام بۆچی ئەمانە وا هەست دەكەن كە خۆیان لەسەر هەقنو پێویستە هەمیشە لای ئەوان بگیرێی؟

قولەڕەش: چونكە سپی پێستن.

لیزێ: ئێ خۆ منیش سپی پێستم. (بێدەنگییەك. دەنگەدەنگی هەنگاونان لە دەرەوە). وا





دادەبەزنە خوارەوە. (لیزێ بێ ئەوەی بیەوێ خۆی لە قولەڕەش نزیك دەكاتەوە. ئەویش لە ترسان هەڵدەلەرزێ، بەڵام دەست دەكاتە ملی لیزاوە. دەنگی هەنگاوەكان وردەوردە كەم دەبێتەوە. بێدەنگی). (لیزێ لەناكاو لێی دوور دەكەوێتەوە). ئەمەتا، دەبینی! چەند تەنیاو بێكەسین! ئێمە عەینەن دوو هەتیو واین. (لە زەنگی دەرگاكە دەدرێ. بێدەنگ گوێ هەڵدەخەن. دیسان زەنگ). راكە ناو تواڵێتەكەوە! (لە دەرگا دەدرێ. قولەڕەش خۆی دەشارێتەوە. لیزێ دەچێ دەرگا بكاتەوە).

# دیمەنی پێنجەم

## فرێد، لیزێ

لیزێ: تۆ شێت بووی؟ بۆچی ئاوها لە دەرگا دەدەی؟ نا. ناهێڵم بێیتە ژوورەوە. ئەوەی بەسەرت هێناوم، بەسمە ئیتر. لاچۆ، دەفن بە، هەی نەگریس! بڕۆ! وەل بە! (فرێد پاڵی پێوە دەنێ. دەرگاکە دادەخاتەوەو هەردوو شانەکانی دەگرێ. بێدەنگییەکی زۆر). ئێ؟!

فرێد: تۆ ئیبلیسی!

لیزێ: دەتویست دەرگاکەم بشکێنیتو بێی ئاوهام پێ بڵێی؟ سەیر، ئەم چڕوچاوە. تۆ لە کوێ هاتوویتەتە دەر بەس پێم بڵێ.

فرێد: قولەڕەشێکیان دەسگیر کردووە، بەڵام ئەو نەبووە. کەچی هەر لە سێدارەشیان داوە.

لیزێ: چیی تر؟

فرێد: منیش هەر لەگەڵیان بووم.

(لیزێ فیتەیەك لێدەدا).





لیزێ: براڤۆ. (بێدەنگییەك). هەزار ئافەرین بۆ تۆ کە هێندە چێژ لەمە دەبینی قولەڕەش بە دارەوە هەڵبواسرێن!

فرێد: حەزم چۆتەوە تۆ.

لیزێ: چی؟

فرێد: تۆ ئیبلیسی. تۆ جادووت لە من کردووە. لەناو خەڵکەکە، دەست بە دەمانچەوە، تەماشای قولەڕەشەکەم دەکرد بە پەتی سێدارەوە؛ لەناکاو تۆم بیرکەوتەوەو حەزم چووە تۆ. ئەمە هیچ شتێکی سروشتی نییە، زۆر سەیرە.

لیزێ: وازم لێبێنە. پێت دەڵێم وازم لێبێنە!

فرێد: پێم بڵێ بزانم هۆی ئەمە چییە؟ تۆ چیت لە من کردووە هەی جادووگەر؟ من تەماشای قولەڕەشەکەم دەکرد، کەچی تۆم دیت بە دارەکەوە بەسترابوویتەتەوەو لەناو ئاگرەکەدا دەلەنگایتەوە. چەند گوللەیەکیشم تێی گرت.

لیزێ: چەپەڵ. بەرمدە. وازم لێبێنە. تۆ پیاوکوژیت.

فرێد: تۆ چیت لێکردووم؟ چۆن ددانەکانم بە پدوومەوە نووساون. تۆش ئاوها خۆت چەقاندۆتە ناو منەوە. هەمیشە زگت دێتەوە پێش چاوم، ئەو زگە پیسەت کە دەڵێی زگی سەگە. هەست بە گەرماییت دەکەم لەناو دەستەکانی خۆمدا. بۆنت لە کەللەم ناچێتە دەرەوە. لەوێڕا هەر بە راکردن بۆ لای تۆ هاتم، نازانم بۆ ئەوە بوو کە بێم بتکوژم یان بێم بتخەمە ژێر خۆمەوە بەزۆر. ئێستا، دەزانم. (فرێد لەناکاو بەرەڵای دەکا). ناتوانم لەپێناو سۆزانییەك خۆم بخەمە حەپسخانەوە. (فرێد دەگەڕێتەوە لای). ئەوەی ئەم بەیانییە بە منت گوت، بە راستت بوو؟

لیزێ: چیم بە تۆ گوت؟

فرێد: دەتگوت کە دڵت بە من دەکرێتەوە؟

لیزێ: وازم لێبێنە!

فرێد: توخوا پێم بڵێ بە راستت بوو! قەسەمم بۆ بخۆ، بە راستت بوو؟ (فرێد: دەستی بادەدا. لەو کاتەدا لە توالێتەکەوە دەنگەدەنگێك دێ).





چییە ئەوە؟ (گوێ هەڵدەخا). دەڵێی کەسێك لێرەیە.

لیزێ: ئەوە تۆ شێت بووی؟ کەسی لێ نییە.

فرێد: با. کەسێك لەناو توالێتەکەیە. (بەرەو توالێتەکە دەڕوا).

لیزێ: مەچۆرە ژوورەوە.

فرێد: تۆ باش دەزانی کە کەسێك لەوێیە.

لیزێ: مشتەریی منە. پیاوێکە کە پارەی خۆی دەدا. تەواو؟

فرێد: مشتەری؟ تۆ لەمەودوا هیچ مشتەرییەکت نامێنێ. تۆ لەمەودوا تەنیا بۆ من دەبیتەو بەس. (بێدەنگییەك). دەمەوێ سەروکەللەی ئەو مشتەرییەت ببینم. (هاوار دەکا) وەرە دەرەوە لەوێ!

لیزێ (هاوار دەکا): نەیەیتە دەرەوە. ئەمە تەڵەیە.

فرێد: هەی سۆزانیی پیسی.

(بە توندییەوە لیزێ دەخاتە لاوەو دەرگای توالێتەکە دەخاتە سەرپشت. قولەڕەش دێتە دەرەوە).

فرێد: ئەمە بوو موشتەرییەکەت؟

لیزێ: شاردبوومەوە چونکە دەیانویست ئەزیەتی بدەن. نەیکوژی، تۆ خۆت باش دەزانی کە ئەو هیچ تاوانێکی نییە. (فرێد دەمانچەکەی سوار دەکا. قولەڕەش تەکانێك دەداو دێتە دەرەوە. فرێد بەدوایدا رادەکا. لیزێ بەدوایاندا تا دەمی دەرگای چوونەدەرەوە دەڕواو پاشان دەست دەکاتە گریان). بێتاوانە. هیچ خەتایەکی نییە! (دەنگی دوو گوللە دێ. لیزێ دەگەڕێتەوە ناو ژوورەکەی، دەموچاوی زۆر گرژ. بەرەو لای مێزەکە دەڕوا، دەست دەداتە دەمانچەکەی. فرێد دەگەڕێتەوە. لیزێ روو دەکاتە فرێد، پشتی لە بینەرە، دەمانچەکەی لە پشت خۆی شاردۆتەوە. فرێد دەمانچەی خۆی لەسەر مێزەکە فڕێ دەدا). چی بوو، دۆزیتەوە؟ (فرێد وەڵام ناداتەوە). باش. ئێنجا ئێستا نۆرەی تۆیە. (لیزێ رووی دەمانچەکەی لە فرێد دەکا).

فرێد: لیزێ، رەحم بە دایکم بکە!

لیزێ: دەمت داخە. ئەم گاڵتەیەتان پێشتر پێکردووم.





فرێد (بە ئاستەم بەرەو لای لیزێ دەڕوا): کلارکی یەکەم، سەرۆك بنەماڵەی ئێمە، بە تاقی تەنیا یەك دارستانی ئاوەدان کردۆتەوە؛ شازدە لە هیندییەکانی بە دەستی خۆی لەناو برد پێش ئەوەی شەهید ببێ. کوڕەکەیشی، دەتوانم بڵێم، سەرجەم ئەم شارە، ئەو بوو دایمەزراندو ئاوەدانی کردەوەو بۆ خۆیشی چوو لەپێناو سەربەخۆیی ئەمریکا لە نیوویۆرك گیانی خۆی فیدا کرد. باوکی باپیریشم سەرۆکی ڤیگیلانتەکان بوو لە سان فرانسیسکۆ، بیستو دوو کەسی لە کاتی ئاگر کەوتنەوەکەدا رزگار کردبوو. باپیریشم هات لێرە بژی، ئاوی (مسیسپی)ی راکێشا بۆ ئێرەو کردیانە پارێزگاری ئێرە. باوکم سیناتۆرە، منیش لە دوای ئەو جێی دەگرمەوەو دەبمە سیناتۆر. من تاقانە کوڕی ئەومو دوایین کلارکی بنەماڵەکەم. ئێمە بووین ئەم ناوچەیەمان ئاوەدان کردەوەو مێژووی ئێرە مێژووی بنەماڵەکەی ئێمەیە. ئەندامانی بنەماڵەکەی ئێمە لە ئالاسکاو

فیلیپین‌و مەکسیکی تازەش هەر هەن. تۆ جۆرئەت دەکەی گوللە بە هەموو ئەمریکاوە بنێی؟!

لیزێ: هەر بجوولێیتەوە، مێشکت دەپژێنم.

فرێد: لێم دە! دەی دەستی پیا بنێ! دەبینی! ناتوانی! کچێکی وەکو تۆ ناتوانێت پیاوێکی وەکو من بکوژێت. تۆ کێی؟ تۆ چ کارەی لەسەر ئەم دنیایە؟ تۆ تەنیا تا باپیرەی خۆت دەناسی، بەڵام من.. من دەبێ بژیم، هەزار شت هەن دەبێ ئەنجامیان بدەم‌و چاوەڕێم دەکەن. ئەم دەمانچەیەتم بدەرێ! (لیزێ دەمانچەکەی دەداتێ، فرێد دەیخاتە ناو باخەڵی). قولەڕەش زۆر خێرا رایدەکرد، لە دەستم قوتار بوو. (بێدەنگییەك. فرێد دەستەکانی خۆی ئاوێزانی لیزێ دەکا). لەمەودوا، ماڵی تۆ لەسەر گردەکە دەبێ، لەوبەر رووبارەکە، خانوویەکی خۆش‌و چیمەنێکی گەورە. بۆ خۆت لەناو ئەو چیمەنە پیاسە بکە، بەڵام ناهێڵم هەرگیز بچیتە دەرەوە، غیرەت لێدەکەم. هەفتەی سێ جار دێم





دەتبینم، هەر کە شەو دادێ، سێ شەمموان‌و پێنج شەمموان‌و کۆتایی هەفتان. چەند قولەڕەشێك دەبنە خزمەتکارت‌و هێندەش پارەت لە بەردەستدا دەبێ کە بە خەنیش نەتدیوە. بەڵام دەبێ چاوپۆشی لەو شتانە بکەی کە ورکیان لێدەگرم. دەشمبێ.

(لیزێ کەم کەم ئارام دەبێتەوەو دەچێتە باوەشی).

فرێد: ئەمە راستە کە تۆ دڵت بە من دەکرایەوە؟ بە راستت بوو؟

لیزێ: بەڵێ، بە راستم بوو.

فرێد (دەستێکی پیادەهێنێ): زۆر باشە. ئێستا هەموو شتێك کەوتەوە سەر دۆخی خۆی. (بێدەنگییەك). من ناوم فرێدە.

(پەردە)

## كتێبە چاپكراوەكانی دیكەی وەرگێڕ:

١) ماڵئـــاوا ئـــەی وڵاتەكـــەم، شـــانۆنامە، بڵاوكـــراوەی یەكیـــەتیی نووسەرانی كوردستان – شاخ، ١٩٨٤.

٢) بـەیانی بـاش ئـەی غـەریبی، شـانۆنامە، بنكـەی یـەكگرتن لـە كۆپنهاگن، ١٩٨٨.

٣) ئیگزیـل Exile شـیعر، بڵاوكـراوەی ئەنـستیتووی كـورد لـە پاریس، پاریس، ١٩٩٢.

٤) ژمارەكـانی گۆڤـاری كوردسـتان (ئەسـتەمبول، ١٩١٩)، دەزگـای گوڵان، هەولێر، ١٩٩٨.

٥) ڕۆژنامەگەریی كوردی بە زمانی فەرەنسی، سـەنتەری برایـەتی، هەولێر، ١٩٩٨، (چاپی٢، دەزگای خەندان، سلێمانی، ٢٠٠٦).

٦) سەرچاوەكانی كوردناسی، بنكەی گەلاوێژ، سلێمانی، ١٩٩٨.

٧) زێڕی ناو زبڵ، تۆژینـەوەو تێكستی وەرگێـڕدراوی كوردۆلۆژی، دەزگای سەردەم، سلێمانی، ١٩٩٩.

٨) ئینجیل لـە مێـژووی ئـەدەبیاتی كوردیـدا، دهـۆك، ١٩٩٩. (چاپی دووەم بە كرمانجیی ژووروو، دهۆك، ١٩٩٩).

٩) وێنـەی كـورد لـە ئەرشـیفی كوردناسـەكاندا، بنكـەی وێـران، هەولێر، ١٩٩٩.

١٠) جوایـەز، شـیعر (بـە هاوبەشـی شـاعیرانی دیكـەی هـەولێر)، دەزگای ئاراس، ١٩٩٩.

١١) سپیاتییەكانی ناو ڕەش، شیعر، بنكەی وێران، هەولێر، ١٩٩٩.



١٢) دراسـات في تـاريخ الكـورد، ترجمـة: تـرزه جـاف، رابطـة كـاوا، بيروت، ١٩٩٩.

١٣) مەلا مەحموودی بایەزیدی، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٠.

١٤) ڕۆژنامـەی كوردسـتان (١٨٩٨)، بـە هاوبەشـی بنكـەی گەلاوێـژ، سلێمانی، ٢٠٠٠.

١٥) پەتاتەخۆرەكان، كۆمەڵە چیرۆك، هەولێر، ٢٠٠٠. (چاپی٢، بنكەی هاڤیبوون، بەرلین، ٢٠٠٢؛ چاپی٣، هاموون، سلێمانی، ٢٠٠٥).

١٦) مێژووی شانۆ لە ئەدەبیاتی كوردیدا، دەزگای ئاراس، ٢٠٠١.

١٧) مـولازم تەحـسینو شـتی تـریش، نۆڤلێـت، بنكـەی گەلاوێـژ، سلێمانی، ٢٠٠١.

١٨) ژەنەڕاڵ شەریف پاشا، تۆژینەوەی مێـژوویی، دەزگای سـەردەم، ٢٠٠١.

١٩) چۆڵـستان، وەرگێڕانـی كۆمەڵـە چـیرۆكی پەتاتـەخۆرەكان بـۆ ڕێنووسـی لاتینـی – كرمـانجیی ژووروو، دەزگـای ئاڤێـستا، ئەستەمبۆڵ، ٢٠٠١.

٢٠) جوایـەز (چـیرۆكو بەرهـەمی هاوبـەش لەگـەڵ شـاعیرانی هەولێر)، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠١.

٢١) عەبـدولڕەحیم ڕەحمـی هـەكاری، تۆژینـەوەی ئـەدەبی، دەزگای سپیرێز، دهۆك، ٢٠٠٢.

٢٢) مێژووی وەرگێڕان لـە ئـەدەبیاتی كوردیـدا لـە كۆنـەوە تـا ١٩٣٢، بڵاوكراوەكانی گۆڤاری ئاسۆی پەروەردەیی، هەولێر، ٢٠٠٢.

٢٣) سانتیاگۆ دی کۆمپۆستێللا، رۆمان، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٢. (چاپی٢، دەزگای رۆژهەڵات، سلێمانی، ٢٠٠٥).
٢٤) پیاوێکی شەپقەڕەشی پالتۆڕەشی پێڵاوشین، رۆمان، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٣. (چاپی٢، وەزارەتی رۆشنبیری، سلێمانی، ٢٠٠٥).
٢٥) منداڵباز، رۆمان، بڵاوکردنەوەی ماڵی شەرەفخانی بەتلیسی، هەولێر، ٢٠٠٣. (چاپی٢، یانەی قەڵەم، سلێمانی، ٢٠٠٦).
٢٦) حەشیشەکێشان، شانۆنامە، بڵاوکراوەی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٣.
٢٧) باوك، شانۆنامە، نووسینی ئۆگۆست ستریندبێرك، و. لە فەرەنسییەوە، دەزگای ئاراس، ٢٠٠٤.
٢٨) باخچەیەك شیعری فەرەنسی، لە فەرەنسییەوە، دەزگای سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٤.
٢٩) رێبازە ئەدەبییەکان، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٤. (چاپی٢، دەزگای وەرگێڕان، هەولێر، ٢٠٠٦).
٣٠) چەند نامەیەکی فەرەنسی، سەنتەری رووناکبیریی هەتاو، چاپی یەکەمو دووەم، هەولێر، ٢٠٠٥.
٣١) وێنەی کورد لە ئەرشیفی کوردناسە ئەوروپییەکاندا، وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٥.





٣٢) مێژووی شیعری نوێی کوردی ١٨٩٨ – ١٩٥٨، تۆژینەوە، دەزگای هانا، هەولێر، ٢٠٠٦.
٣٣) رەئیس رەمەزانەکان، چیرۆك، دەزگای هانا، هەولێر، ٢٠٠٦.
٣٤) زمانی حەیزەران، لەبارەی کێشەی گەنجو قوتابییانەوە، تۆژینەوە، چاپخانەی رەنج، سلێمانی، ٢٠٠٦.
٣٥) بۆ رۆدانی کوڕم، شیعر، چاپخانەی پاك، هەولێر، ٢٠٠٦.
٣٦) پێنج کتێبو نیو، شیعر، دەزگای رۆژهەڵات، سلێمانی، ٢٠٠٦.
٣٧) کورد لە دیدی رۆژهەڵاتناسەکانەوە، تێکستو تۆژینەوە، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٦.

٣٨) مێژووی هونەری شێوەکاری لە کوردستاندا، لە کۆنەوە تا ١٩٥٨، بڵاوکراوەی گۆڤاری شێوەکاری، دەزگای مێرگ، هەولێر، ٢٠٠٧.
٣٩) کرۆنۆلۆژیای کوردستان، دەزگای بەدرخان، هەولێر، ٢٠٠٧.
٤٠) حەکایەتەکانی باوکم، رۆمان، چاپخانەی شڤانو دەزگای بەدرخان، سلێمانی – هەولێر، ٢٠٠٧.
٤١) هەڵبژاردەیەك لە شیعرەکانی ژاك پرۆڤێر، وەرگێڕان لە فەرەنسییەوە، دەزگای سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٧.
٤٢) سوڵتانە عوسمانییەکان، تۆژینەوەو ئەلبووم، چاپخانەی رەنج، سلێمانی، ٢٠٠٧.